# راپەڕینی کوردان
## ساڵی ١٩٢٥

نووسینی

**پرۆفیسۆر م. أ. حەسرەتیان**

وەرگێڕانی

**جەلال دەباغ**

٢٠٠٦


ناوی کتێب: راپەڕینی کوردان ساڵی ١٩٢٥

- نووسینی: م. أ. حەسرەتیان
- وەرگێڕانی: جەلال دەباغ
- نەخشەسازی ناوەوە: طـــه حسین
- بەرگ: ئاسۆ مامزادە
- چاپ: کاوە حسین
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- تیراژ: (١٠٠٠) دانە
- ژمارەی سپاردن: (٦٠٠)
- چاپی دووەم: هەولێر ٢٠٠٦
- چاپی یەکەم: ساڵی ١٩٨٤ لە چیاکانی کوردستانی باشوور چاپکراوەو ٢٠٠ دانەی لێ بڵاوکراوەتەوە
- نرخ: (١٥٠٠) دینار
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب: -٨٦- (١٨٩)

ISBN 91-973437-7-3

دەزگای توێژینەوەو بڵاوکردنەوەی موکریانی

www.mukiryani.com

asokareem@ maktoob.com

2260311

## ناوەڕۆك

## ناوەڕۆك

# پێشەکی چاپی کوردی

**خوێنەری هێژا و خۆشەویست.!**

لەوەتەی دەوروپشتی خۆمان ناسیوە، ئێمە لە کوردستانی عێراق، ناوی شێخ سەعید و هەواڵی راپەڕینە پیرۆزەکەی دەبیستین و کوردستانی تورکیامان لەناوی شێخ سەعید و راپەڕینەکەی کوردان بە رابەرایەتی شێخی نەمر جودا نەکردۆتەوە، بەڵام ئەم ناوبیستن و هەواڵ زانینە زۆر کەم بووە.

کاتێك ئەم دانراوەی پرۆفیسۆر حەسرەتیان-م خوێندەوە، کە برای هێژا (باقی نازێ) لە روسییەوە کردوویە بە عەرەبی و برای دڵسۆز (باقی شیرین) چاوی پێداگێڕاوەتەوە، یەکسەر بڕیارمدا بیکەمە کوردی، تا چاپ و بڵاوی بکەینەوە و رۆڵەکانی گەلی کوردمان لە کوردستانی عێراق و ئێراندا لێ ئاگادار بکەین. لێرەدا دەمەوێ بڵێم بە تەواوی هاوبیر و هاودەنگم لەگەڵ ئەو وتارە پێویستەدا کە مامۆستای وەرگێڕ بۆ چاپی عەرەبی نووسیوە و سەرەڕای ئەوە دەڵێم ((ئای کە پێویستە رۆڵەکانی گەلەکەمان، بەتایبەتی لە کوردستانی عێراقدا، هەروا رێکخراو و حزب و هێزە نیشتیمانپەروەرەکان بە گشتی، بە وردی و ژیری لەم دانراوە



بچکۆڵەیە، بایەخدار و گرنگە بکۆڵنەوە و لە دەرس و پەند و تاقیکردنەوە مێژووییەکانی راپەڕینەکەی شێخ سەعید کەڵك و سوودی تەواو وەربگرن. سەرەڕای پەند و دەرسەکانی شۆڕشەکانی شێخ مەحموودی حەفید و شۆڕشی ئەیلولی ١٩٦١ و کۆماری کوردستان لە مەهاباد و ئەوانی تر. رۆژێکیش زووتر دەستبەرداری شەڕی برا کوژی و ناوخۆ بێن و بگەنە ئەو راستییە کە یەکێتی و خەباتی هاوبەش مەرجی سەرەکی و زامنی هێنانەدی ئامانجەکانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کوردەو، خۆ ئەگەر گەیشتنە ئەو راستییەش ئەوا هێنانەدی ئەو یەکێتییە سەرکەوتن دابین دەکات)).

لێرەدا دەمانەوێ هەر لەو کاتەدا کە نرخپێدان و ستایشی زۆرمان بۆ نووسەرەکە، مامۆستا (حەسرەتیان) و وەرگێڕی نووسینەکە بۆ زمانی عەرەبی دەربڕین، ئەوەش دووپات بکەینەوە کە زانایان و مێژوونووسانی یەکێتی سۆڤیەت بەگشتی و کۆماری ئەرمینیای سۆڤیەت بەتایبەتی، بە چەشنێکی راستگۆیانە و دەستپاك و مەوزوعیانە لە بابەتەکانی زانست و مێژوو دەکۆڵنەوە و بایەخیشیان بە مێژووی نەتەوەی ئێمە رۆژ لە دوای رۆژ زۆرتر دەبێ کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا شایانی پێزانین و سڵاو و ستایشی نەتەوە چەوسێنراوە بەش بەشکراوەکەمانە.

ئێمە کە وەرگێڕانی کوردیی ئەم نامیلکە بەنرخەی پرۆفیسۆر (حەسرەتیان) پێشکەش بە خوێنەرانی بەڕێزی کورد دەکەین و چاومان بڕیووەتە ئەو رۆژەی نموونەی ئەم نووسینە بەرزەیان تێدا بەزۆربەری زمانەکانی ناوچەکە و

جیهان چاپ و بڵاودەکرێتەوە و بزاڤی رزگـاریخوازی کـوردیش سـەرکەوتنی مەزن بێنێتە دی.

هیواداریین بە وەرگێڕانی ئەم نامیلکە بەنرخە خزمەتێکی بچووکمان بە گەڵ و مێژووی نەتەوەکەمان کردبی.

**جەلال دەباغ**

**تشرینی دووەمی ١٩٨٤**

# پیشەکی چاپی عەرەبی:

## وتارێکی پێویست

ئەم نامیلکەیەی وا لەبەر دەستی خوێنەراندایە لێکۆڵینەوەیەکە لەلایەن مۆنتیل حەسرەتیان- دکتۆری زانستەکانی مێژوویی-یەوە لە گۆڤاری پەیمانگەی رۆژهەڵاتناسی سەر بە ئەکادیمیای ئەرمەنی لە یەریڤان، بڵاوکراوەتەوە. شایانی باسەکە بڵێین دکتۆر (حەسرەتیان) هەندێك نووسینی تریشی لەسەر مێژووی گەلی کورد هەیە و تا ئێستاش لەم بوارەدا لەسەر پشکنین و لێکۆڵینەوە و توێژینەوە بەردەوامە و هەروا سەرۆکی بەشی کوردییە لە پەیمانگەی رۆژهەڵاتناسی سەر بە ئەکادیمیای ئەرمەنی لە یەریڤان.

حەسرەتیان لەم نامیلکەیەدا باسی راپەڕینەکەی شێخ سەعید دەکات، ئەو راپەڕینەی ناوبانگی لە دنیادا بڵاوبۆتەوە و گەلێك لە نووسەران باس و لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنیان لەسە نووسیوە. لە ناو رۆڵەکانی گەلەکەماندا کەسێك نییە شتێك لەسەر ئەم راپەڕینە نەزانێت. سەرەڕای ئەوەش بە چاکمان زانی ئەم لێکۆڵینەوەیە بکەینە عەرەبی،



چونکە وەك ئێمە بزانین- ئەمە یەکەمین بابەتە لەم جۆرە کە بە عەرەبی چاپ و بڵاوبکرێتەوە.

دکتۆر (حەسرەتیان) زانا و مێژوونووسە و بەگیانی زانایەکی مەوزوعی ئەم راپەڕینەی باس کردووەو سەرەڕای خۆئامادەکردن بۆ راپەڕینەکە واقیعی هێزە سیاسییەکانی ئەو سەردەمەی خستۆتەڕوو. ئەوجا لە رەوتی راپەڕینەکە و هەلومەرجی ئەو کاتە کۆڵیوەتەوە و دواجار باسی کۆتاییهاتنە دڵتەزێنەکەی کردووە.

ئەم لێکۆڵینەوەیە کارێکی مەوزوعی و زانستانەیە. لەبەر ئەوە خوێنەر لەوانەیە لەم خاڵەدا لەگەڵێدا هاوبیر بێ و لەو خاڵەدا لەگەڵێدا هاوبیر نەبێ. بەڵام لە هەردوو حاڵەتدا وا هەست دەکات کە ناچارە راستگۆیی و مەوزوعێتی دانەرەکە رێز لێبگرێت.

خوێنەر لە خوێندنەوەی ئەم نامیلکەیەدا سەرنجەدا کەوا کەمالییەکان بە درندەییەکی وا راپەڕینەکەی کوردانیان دامرکاندەوەکە نێوچاوان لە شەرمەزاریدا ئارەقەی بۆ دەرێژێ. هەموانیش ئاگاداری ئەو کوشت و بڕەن کە لە ساڵی ١٩١٥ دا بەرامبەر گەلی ئەرمەن کرا و دەی سا با پێکەوە بروسکەی وەزیری ناوخۆی تورکیا بۆ پارێزگاری حەلەب بخوێنینەوە:

((ئێمە لە بڕیاری جەمعیەت ئاگادارمانکردن کە سەبارەت بە قڕکردن و نەهێشتنی ئەرمەنەکانی تورکیا دراوە. هەر کەس لە دژی ئەم بڕیارە بوەستێت رێگەی نادرێ لە دایەرەکانی دەوڵەتدا فەرمانی بدرێتی یان

لەسەر فەرمان بەردەوام بێ. ئەو کاروبارەی دەکری هەرچەند سەخت و دلڕەقانە بێ بۆ لەناوبردنیان پێویستە. گوێ مەدەنە تەمەن و جنس و ئازاری وێژدان)). جا ئاخۆ ئەو بڕیارە وەك بڕیارەکانی نازییەکان نین کە لەوە و دوا پەیدابوون؟ جا خوێنەران سەرنجدەدەن کە گەلێك بڕیاری لەم بابەتە و رەنگە سەختتریش لەلایەن حکومەتی ناهەمواری تورکیاوە بەرامبەر گەلی کورد لە کوردستانی تورکیادا دراوە؟. بەڵێ وەڵامی مستەفا کەمال ئاوها بوو، وەڵامی ئەو کابرایەی کە رۆژێك لە رۆژان پەنای بردەبەر ویلایەتەکانی رۆژهەڵات و بەڵێنی بە گەلی کورددا کە مافە نەتەوەییەکانی پێبدا.

راپەڕین لە مێژووی گەلی کوردماندا زۆرن، بەڵام کوشت و بڕ و قەسابخانە و سەربڕین بەرامبەری زۆرترن. بزووتنەوەکانی کورد لە هەموو بەشەکانی کوردستاندا، ئەمڕۆ لە هەموو کاتێکی پێشوو زۆرتر داوایان لێدەکرد مێژووی بزووتنەوەی کورد بخوێنن و لێی بکۆڵنەوە تا پەند و دەرس و تاقیکردنەوەی لێوەربگرن و ئەو هۆیانە دیاریبکەن کە بوونە مایەی شکستهێنان و ژێرکەوتنی ئەم یان ئەو بزووتنەوەیە و لەوانەشە کارەکە بۆ ئەوە کرابێ تا دووبارە ئەو هەڵانە نەکرێنەوە. چونکە ئەوە شورەیی نییە بزوتنەوەی کورد بکەوێتە هەڵەوە. بەڵام لەڕاستیدا شوورەیی ئەوەیە کە رووداني ئەو هەڵانە بەردەوام بن و خۆی لێیان بەدوور نەگیرێت. دەشێ ئەم لێکۆڵینەوەیەی دکتۆر حەسرەتیان لەسەر راپەڕینەکەی شێخ سەعید لە پێشەنگی ئەو لێکۆڵنەوانەدا بێ کە لەسەر ئێمەی رۆڵەکانی گەلی کورد، چ



کەسان یان رێکخراوەکان، پێویستە بیخوێننەوە و کەڵکی لێوەربگرن. بەرپا بوونی شۆڕشەکانی، یەك بە دوای یەك، لە مێژووی گەلەکەماندا بەڵگەی هۆشمەندی تەواو و ئاگادارییە سەبارەت بە باری ژیانی پڕ لە ژانی و چاوبڕینە دوارۆژێکی باشتر و کۆششی بەردەوامی بۆ پێکهێنانی ئەو بەیانییە جوانترە، بەیانی ئازادی و ژیانی پڕ لە شادی. رەنگە دکتۆر فوئادیش هەستی بەم خاسیەتە نیشتیمانییەی گەلەکەمان کردبێ، لەو کاتەدا کە بەرەو پەتی سێدارە هەنگاوی دەنا گوتی: ((من هەمیشە خەونی ئەوەم دەدی کە لە پێناوی نیشتمانەکەمدا گیانم بەختکەم، ئێستاش هیچ گومانم لەوە نییە کە ئاڵای سەربەخۆیی لەسەر ئەم خاکەی ئێستا ئێمەی لەسەر لەسێدارەدەدرێین بەرز دەکرێتەوە)).

ئێمە لە کاتێکدا ئەم نامیلکەیە پێشکەشدەکەین بە گەرمی سڵاو و ستایشی ئەو کۆشش و تەقەلایە دەکەین کە زانا و مێژوونووسانی سۆڤیەت بە مەبەستی روونکردنەوەی لایەنە ئاڵۆزەکانی مێژوومان و بووژاندنەوەی لایەنە شاراوەکانی بەختی دەکەن.

## خۆ ئامادەکردن بۆ راپەڕینەکە

راپەڕینەکەی کوردان لە ساڵی ١٩٢٥ دا، لە مێژووی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورددا، شوێنێکی گرنگی هەیە. سەرەتای خۆئامادەکردن بۆ ئەم راپەڕینەی کە پاشان ناوی بە ((راپەڕینەکەی شێخ سەعید)) برا، دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای ساڵانی بیستەکانی ئەم چەرخە. ئەم راپەڕینە بەرهەمێکی چالاکی کۆمەڵە نهێنییەکانی کورد بوو، بەتایبەتی ((کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردستان)) کە لە ئایاری **١٩٣٣** دا لەم کۆمەڵ بوونانەوە هەڵقوڵابوو. ئەم کۆمەڵەیە نهێنی بوو، لە چەند دەستەیەکی نهێنی پێکهاتبوو کە هەریەکەیان پێنج کەس بوون. بە پێی ناوی نهێنی بزووتنەوەکە یەکتریان دەناسی. هەروا لە دەرەوەی شانەکەیان نەدەبوو یەکتر بناسن، پەیوەندیش لەگەڵ شانەکە بە رێگەی یەکێك لە ئەندامانی دەستەی بەرەو ژوورترەوە رێکدەخرا(*): لەسەر ئەندامەکانی پێویست بوو ناوی رێکخراوەکە بڵاونەکەنەوە، هەر کەسێك ئەوەی بکردایە بە توندی سزا دەدرا. ئەوکاتە عەقید خالد جبری بەگ رابەری رێکخراوەکە بوو. کە

(*) M. Toker. Seyh Sait ve Isyani Ankara 1968-5-35.



لە نزیکخستنەوەی حاجی موسای سەرۆکی خێڵی موتکا لە سەرکردایەتی رێکخراوەکەدا بەشداری کردبوو (حاجی موسا لەوەوبەر ئەندامی نوێنەرانی ئەو لیژنانە بوو کە ساڵی **١٩١٩** لە کۆنگرەی ئەرزرووم‌دا هەڵبژێردرا بوون). هەروا عەقید جبری بەگ لە نزیکخستنەوەی خالدی حوسنی بەگی سەرۆکی خێڵی حەسنان لە سەرکردایەتی ئەم رێکخراوەیە بەشداری کردبوو(*). هەروا هەوڵی دەدا دڵی سەرۆك خێڵەکانی تریش راکێشێ. لەم ماوەیەدا کۆمەڵە توانی هەندێك رێکخراو لەناو سوپادا دامەزرێنێ و لایەنگیری هەندێك لە ئەفسەران بەدەستبخات. لەناو ئەوانەدا ئەفسەرانی عێراقیش هەبوون، ئەمەش بووە مایەی رێکخستنی پەیوەندی لەگەڵ بەغدا و حەلەبیش. لەلایەکی تریشەوە رابەرانی کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردستان، هەوڵیاندا کاربەدەستانی ناوخۆ کە لایەنگیریان بوون، هەروا سەرۆکی خێڵەکانی رۆژهەلاتی ولات، لە چالاکیاندا بەشدارییان بکەن. بە بیروڕای ئەوان ئەم هەنگاوانە، بۆ سەرکەوتنی خەباتی چەکدارانە لە پێناوی هێنانەدی ئامانجەکانی کۆمەڵەدا زۆر پێویست بوون(*). یەکێك لەوانەی سەرکردەکانی کۆمەڵە

(*) خالد حەسنان بەگ سەرۆکی خێڵی حەسنان بوو. هەر لەو کاتەشدا رابەری چوار کەتیبەی ((حەمیدی)) بوو. خالد بەگ لەلایەن خێڵی حەسنانەوە کە سەدان سوارەی چەکداری هەبوو زۆر پشتگیری دەکرا.

(*) حوسێن بارزانی. حزب و رێکخراوە کۆمەلایەتییەکانی کورد لە خەباتدا لە پێناوی چارەی مەسەلەی کورددا (نامەی دکتۆرا) مۆسکۆ ساڵی ١٩٧٦، ل٤٥ (بە زمانی رووسی).

هەولێاندەدا بۆ لای خۆیان راکێشن، شێخ سەعید بوو کە لە کوردستانی تورکیادا خاوەنی ناوبانگ و دەسەڵاتێکی گەورە بوو(*).

شێخ سەعید پایەیەکی کۆمەڵایەتی بەرز و سامانێکی زۆری هەبوو، هەر لەبەر ئەوەش بوو رابەرانی کۆمەڵەکە بڕیاریاندا پەیوەندی لەگەڵ ببەستن و بۆ کارکردن لەگەڵیان گازیبکەن. لە کۆتایی هاوینی **١٩٢٣** دا یوسف زەیا (کە یەکێك بوو لە رابەرانی بزووتنەوەی کورد و پێشان نوێنەری بەدلیسی بوو لە پارلەماندا) لە خەنس چووە لای شێخ سەعید و لەم چاوپێکەوتنەدا لەسەر ئەوە رێککەوتن کە دەنگوباس بۆ یەکتری باسبکەن و دەربارەی رێکخستنی راپەڕینی کوردان کاروبار پێکەوە رێکبخەن.

لە زستانی **١٩٢٣-١٩٢٤** دا رابەرانی کورد لە بالو کۆبوونەوە و بڕیاریاندا کە پێویستە چالاکی و هەڵسوڕانی بزووتنەوەی نهێنی کورد گەرمبکەن.

ژمارەی ئەندام و لایەنگرانی بزووتنەوەکە هەر لە زۆربووندا بوو؟ جابۆ ئەوەی سەرنجی حکوومەت رانەکێشن رابەرانی بزووتنەوەی کورد بە

(*) شێخ سەعید لە ناوچەی بالو لە ساڵی ١٨٦٥ دا لە دایك بووە. شێخ عەلی سەبتی باپیری لە کۆتایی چەرخی هەژدەیەمدا لە گوندی سەبتی (نزیك دیاربەکر)ەوە باریکردووە بۆ بالو لەوێ لەسەر شێخێتی بەردەوام بووە. شێخی نەقشبەندی بووە. شێخ عەلی پێنج کوڕی بووە یەکێکیان شێخ مەحموودی باوکی شێخ سەعید بووە. پاش کۆچکردنی دوایی شێخ عەلی سەبتی شێخ مەحموود لە خەنس نیشتەجێ بوو، هەر لەوێش شێخ سەعید زانیاری ئایینی خوێند. بڕوانە:
Toker-Seyh. Sait ve Isyani. S. 31.



نهێنی و لە کۆبوونەوەی تەنگەبەردا بڕیاریان دەدا. بۆ نموونە یوسف زەیا لە بەهاری **١٩٢٤** دا لای خالد جبری بەگ لە ئەرزڕۆم ((میوان)) بوو کە لەو چاوپێکەوتنەدا بڕیاریاندا، بە یارمەتی شێخ مەحمود و ئیسماعیل ئاغای سمکۆ کە هەردووکیان لە دەرەوەی تورکیا بوون، خێلە کوردەکان بەتەواوی چەکدار بکەن. هەروا رێککەوتن لە رێگەی سوریاوە یادداشتێك بنێرن بۆ کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان و داوایان لێبکەن یارمەتی بە کوردان پێشکەشبکەن. پاشان یوسف زیا نامەیەکی لە جبری بەگەوە برد بۆ شێخ سەعید کە لە کۆمسار بوو (ناحیەی خنس)، ئینجا چووە سەردانی ناوچەکانی تری وەك غویکسو، حاجی هومەر، تورکمان، غوکوگلان، کارلیوفا، ڤارتۆ، بەو چەشنە سەرۆك خێلەکان لەو بڕیارانەی کە درابوون ئاگادارکران(*).

لە پایزی **١٩٢٤** دا یوسف زەیا گەیشتە ئەستەنبوڵ و لەگەڵ ئەندامانی حزبی کۆماریی پێشکەوتنخوازدا(*) هەروا لەگەڵ کەسانیتری ناسراوی بەرهەڵستکاری مستەفا کەمالدا پەیوەندیی گرت.

(*) Serif Firat, Dosu Illere ve Varto tarihi Ankara 1961. S.P 126.

(*) حزبی کۆماری پێشکەوتنخواز لە تشرینی دووەمی ساڵی **١٩٢٤** دا دامەزراوە. سەرۆکی حزب کازم قەرەبەکر پاشا بوو. ئەمینداری گشتی حزب علی فوئاد پاشا بوو. لە بەرنامەی حزبدا: ((پێشکەوتنی کۆمەلایەتی)) و ((ئیسلاحی)) و ((ریزگرتنی ئایینەکان)) و ((نامەرکەزی)) و کاروباری تری ئیسلاحی باسکرابوون. هەندێك لە نوێنەرەکانی پێشووی

شتێکی ئاسایی بوو کە چالاکی رابەرانی کورد ببێتە هۆی ئاگاداربوونەوەی کاربەدەستانی تورکیا. هەروا هەندێك لە سەرۆکەکانی خێڵی ((خورمیك)) کە خێڵێکی کوردە بە نهێنی کاربەدەستانی حکومەتی تورکیایان لە ئەنقەرە ئاگادارکرد کەوا راپەڕینێك لە ناوایە و خۆی بۆ ئامادە دەکری. بەپێی فەرمانی راستەوخۆی مستەفا کەمال حکومەتی تورکیا هاتن یوسف زەیا و خالد جبری بەگیان گرت و لەگەڵ پاسەوانداریيەکی توندا بۆ بەدلیسیان ناردن تا لەوێ بدرێنە دادگای سەربازی(*) هەروا حاجی موسا کە پێشان ئەندامی لێژنەی نوێنەران بوو گیرا. هەندێ کاروباری تریان بۆ گرتنی چەندان نیشتمانپەروەری ناسراوی کورد جێبەجێ کرد(*).

واپێویست بوو یەکێك هەڵبژێردرێ کە دوای خالد جبری بەگ و یوسف زەیا سەرۆکایەتی (کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردستان) بکات. ئەوەبوو شێخ سەعید هەڵبژێردرا کە ببێتە سەرۆکی کۆمەڵە. ئینجا کۆمەڵە بڕیاریدا راپەڕینێکی فراوان دەستپێبکات و، شێخ سەعید بە یارمەتی فەرمانبەرانی کورد لە دایەرەی پۆستە و بروسکەی گەنج (ولایەتی بینگول) توانی چاوی بەو نامەو بروسکانە بکەوێ کە لە نێوان کاربەدەستە

(کورد)بوونە ئەندامی ئەم حزبە. ئەمەش بووە هۆی فراوان بوونی دەسەڵاتی حزب لە ویلایەتەکانی رۆژهەلاتی ولاتدا.

(*) M. S. Firat, Dosu illeri ve Varto Tarihi. S. 27.

(**) لە ئاداری ١٩٢٥ دا خالد بەگ دەستڕێژی لێکراو کوژرا، بەڵام یوسف زیا لە سێدارە درا.



تورکەکاندا ئاڵوگۆڕ کرابوون. شێخ سەعید بەتایبەتی سەرنجی ئەو لێکۆڵینەوەیەی دەدا کە لەگەڵ خالد جبری بەگ و یوسف زەیا لە بەدلیس دەستیپێکرد کاربەدەستان وایان لاپەسند بوو کە شێخ سەعید وەك (شایەتێك) بۆ دادگا بانگبکەن. بەڵام شێخ سەعید داواکەی دادگای دایە دواوە و بەو بیانووەی کە نەخۆش و پیرە و(*) ناتوانێ لە دادگا ئامادەببێت. لەمەشەوە روون دەبێتەوە کە پێشگرتنی خالد جبری بەگ، کاربەدەستانی تورکیا ئاگاداری چالاکی کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردستان نەبوون. لە تشرینی دووەمی ١٩٣٤ دا کوڕەکەی شێخ سەعید، عەلی رەزا چووە دیاربەکر و حەلەب تا لەگەڵ سەرکردە کوردەکانیتردا لەسەر کاتی رێکخستنی راپەڕینەکە رێککەوێت، کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ کردن کە زۆربەی پیاوە ناسراوەکانی کورد لە تورکیا و عێراق و سوریا بەشداربوون. لەو کۆبوونەوەیەدا بە درێژی وەزعی کوردستانی تورکیا باسکرا و بەشداران هاوبیربوون لەوەدا کە دابینکردنی مافە نەتەوایەتییەکانی گەلی کورد تەنیا لە رێگەی راپەڕینێکی چەکدارانەوە دەهێنرێنەدی. هەروا لەسەر رۆژی دەستپێکردنی راپەڕین لە کوردستانی تورکیادا رێککەوتن کە رۆژی ٢١ی ئاداری ١٩٢٥ (رۆژی جەژنی نەتەوەیی — نەورۆز) دەستپێدەکات. هەروا لەم کۆبوونەوەیەدا دەستەی سەرکردایەتی راپەڕینەکەیان هەڵبژارد(*).

(*) Aksam. 19-8-1925.

(*) M. N. Dersimi, Kurdustan Tarihinde Dersim, Halep 1925. S. 174.

پاش ئەوە عەلی ڕەزا لە ١٥ی تشرینی دووەمی ١٩٢٤ دا چووە ئەستەنبوڵ و چاوی بە پیاوی ناسراوی کورد سەید عبدالقادر کەوت. لەم چاوپێکەوتنەدا عەلی ڕەزا باسی وەزعی ولایەتەکانی ڕۆژهەلاتی کرد و باری سەرنج و نەخشەکانی دەستەی سەرکردایەتی ڕاپەڕینەکەی خستە پێش چاو هەروا باری سەرنجی خۆی لەسەر نەخشەی سەرکردە کوردەکانی حەلەب و عێراق دەربڕی. سەید عەبدولقادر پێشنیارێکی خستە پێش چاوی عەلی ڕەزا کە بزووتنەوەی کورد شێوەیەکی ئایینی هەبێ. ئەو کاتە ئەمیش بە هەموو هێز و توانایەوە دێتە پاڵ بزووتنەوەکە ئەوجا هەندێك چاپەمەنی کە دژی مستەفا کەمال بوون دا بە عەلی ڕەزا تا لە ولایەتەکانی کورد بڵاوبکرێنەوە.

عەلی ڕەزا گشت ئەم مەسەلە و بیروڕایانەی بردەوە بۆ بەشدارانی ئەو کۆبوونەوەیەی کە لە سەرەتای کانوونی دووەمی ١٩٢٥ دا لە گوندی کیریکخان (لە ناحیەی بالو)(*) پێکهات. سەرەڕای ڕێوشوێنی ڕاپەڕینەکە، ئەو ناکۆکییانەی کەوتبووە نێوان کوردە سوننییەکان و کوردەکانی قزلباش کە حەزیان نەدەکرد بێنە پاڵ ڕاپەڕینەکە. لە کۆبوونەوەکەدا ئەوەش گوترا کە بەشداری نەکردنی خێڵەکانی قزلباشی ناوچەی وارتو (ولایەتی موش) و خنس (ولایەتی ئەرزڕوم) مانای بوونی کوسپ و تەگەرەیە لە پێش ڕاپەڕینەکەدا. هەر چەندە شێخ سەعید

(*) M. S. Firat. Dosu illeri ve Varto Tarihi S. 129.



هەوڵی دەدا ئەم خێڵانەش لە ڕاپەڕینەکەدا بەشداربیکەن ، بەڵام ئەوەی بۆ نەچووە سەر. هەروا شێخ سەعید هەوڵیدا خێڵەکانی دەرسیم بۆ ڕاپەڕینەکە ڕاکێشێت بەڵام لەمەشدا سەرنەکەوت(*).

هەر لەو کاتەدا لە زۆر ولایەتی ڕۆژهەڵاتی ولاتدا بەچاکی دەستکرا بە خۆئامادەکردن بۆ ڕاپەڕین لە دژی دەسەڵاتداریی تورك. لەناو سەرکردەی خێڵەکانی دەرسیمدا گفتوگۆ دەربارەی ڕێوشوێنی خەبات بۆ ڕزگاربوون لە تەوقی کۆیلایەتی تورکیا هەر بەردەوام بوو. سەرەڕای ئەوەش زرۆیان سیاسەتی ڕێککەوتنیان پەسەند کرد و بەرژەوەندی خۆیان بە چاکتر دەزانی و هەر لەسەر خەو و خەیاڵ و هیواداری سیاسەتی کەمالییەکان لە بارەی مەسەلەی کوردەوە دەژیان و یەك لەوانەی ئەم ڕێبازەی پشتگیریکرد حەسەن خێری نوێنەری دەرسیم بوو لە ئەنجوومەنی گەلی تورکی مەزندا، هەندێکیش پێچەوانەی هەڵوێستی حەسەن خێری ڕاوەستانەوە، وەك بیار نوری دەرسیمی و سەعید ڕەزا کە هەردووکیان چاری بنەڕەتی مەسەلەی کوردیان پشتگیریدەکرد، هەندێك کەسانی تری ناسراوی کوردیش لایەنگیری ئەمانی دەکردن. لەوانەی کە بڕوایان بە بەڵێن و پەیمانی کاربەدەستانی تورکیا نەکرد و خەباتی چەکداریان بە تاقە ڕێگای هێنانەدی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد دەزانی.

(*) S. S. Aydemir. T. Adam Mustafa Kemal. Cilt.3 Istanbul 1966. S. 225.

سەرەڕای ئەوەش خێڵەکانی دەرسیم لە بزووتنەوەکەی شێخ سەعیددا بەشدار نەبوون. لەکاتێکدا کوردانی رۆژهەلاتی دەرسیم بۆ راپەڕینێکی گەورە خۆیان سازدەکرد، چەند سەرۆك خێلێکی دەرسیم لەسەر پلەوپایەی ناو ئەنجوومەنی گەلی تورکیا لە ناکۆکی دابوون و بەم کارەش یارمەتییەکی باشی کەمالییەکانیاندا کە سوودیان لە ناکۆکی ناو خێلەکان وەرگرت و سیاسەتی دوژمنایەتیکردنی گەلی کوردیان بە جێگەیاند.

ئا لەم ماوەیەدا بێزاری لەناو دانیشتوانی ولایەتەکانی رۆژهەلاتدا پەرەی دەسەند. ئەمەش بە ئاشکرا لەکاتی سەردانەکەی شێخ سەعید بۆ ئەو ناوچانە دەرکەوت. ئەوەبوو بە سەدان چەکداری کورد چوونە پالی. هەروا تەواوی دانیشتوان بە گەرمی پێشوازییان لێکرد. لە نیوەی دووەمی مانگی کانوونی دووەمدا کۆمەڵێکی زۆر لە شێخ و ئیمام و پیاو ماقولان لەگەل شێخ سەعید چوونە سەردانی مەلبەندی ولایەتی داراهینە (گەنج) و ناحیەی لیجەوخانی(*). لە رۆژی ٥ی شوباتی ١٩٢٥ دا شێخ سەعید لەگەل سەد سوارەی چەکدار و کۆمەڵێك لە رابەران خانێ بەجێدەهێلن و دەچنە گوندی پیران(*). لەوێ میوانی عەبدولڕەحیمی برای دەبێ، هەر ئەو شەوە ملازمی یەکەم حوسنی ئەفەندی لەگەل مستەفا عاسم و پانزە سەرباز دەگەنە مالی عەبدولرەحیم و لە شێخ سەعید داوا

(*) M. Toker, Seyh Sait ve isyani S. 37.

(*) گوندی پیران دەکەوێتە ناحییەی ئەرگانی (لە ولایەتی بینگول).



دەکەن دە کوردیان بە دەستەوە بدا کە بە کوشتن تاونبارن و وان لە مالی بەحری ناوێك.

لە وەڵامدا شێخ سەعید گوتی: ((ئێمە بەهەڤرا گەیشتووینە ئێرە، هەڤالی یەکین. هێڤیدارم تا من لڤرم خراپەتان بۆیان نەبێ. کاتی ئەزدچم ئێوە چۆن دەخوازن وابکەن))(*).

شێخ داوای لێکردن کە دەستیان بۆ نەبەن، بەلام ئەفسەرە تورکەکە وای دەربڕی کە رێزی کەس ناگرێت و تەنیا بەپێی یاسای کۆماری دەجولێتەوە و فەرمانیدا تاونبارەکانی بدرێن بە دەستەوە. کاتێك فەرمانی ئەو ئەفسەرە جێبەجێ نەکرا، لێکدانی چەکداری لە نێوان خەلکەکە و کۆمەڵی ئەفسەرەکاندا بە سەرۆکایەتی حوسنی ئەفەندی روویدا. لە ئەنجامدا هەندێکیان لێ کوژران و ئەوانیتر بە دیل گیران و ئەم پێك هەلپژانە کە سالی ١٩٢٥ لە گوندی پیران روویدا رێگەی لە نەخشەی راپەڕینەکە بڕییەوە.

لە راستیدا شێخ سەعید لەو باوەڕەدابوو کە کوردەکان هێشتا ئامادەنین بۆ بەشداری لە راپەڕینێکی گەورەدا. لەبەر ئەوە لە گوندی پیران دەرچوو بەرەو گەنج کەوتەڕێ بۆ ئەوەی رووداوەکەی پیران جلەو گیربکات و رێگەنەدا بۆ ناوچەکانیتر بلاوبێتەوە، بەلام کاتێك شێخ تایەری برای بە رووداوەکانی پیرانی زانی لە رۆژی دەی شوباتدا لە لیجە پۆستەی گرت و لە یانزەی

(*) M. U. Dersimi, Kurddistan tarihinde Dersim- S. 176.

شوباتدا بەخۆی و دووسەد کەسەوە چووە خزمەت شێخ سەعید لە گەنج و ئەو پارە و بەڵگە و ئەوراقانەی گیرابوون بەدەستی گەیاند. ئەم دوو رووداوە بەسەرتای دەستپێکردنی راپەڕینەکە دادەنرێن و ئیتر لەو هەلومەرجەدا لەپێش شێخ سەعیدا هیچ نەمایەوە ئەوە نەبێ بڵێ: ((وا دیارە ئەمە دەستتی قەدەرە))[*] و بەکردەوەش لە راستیدا بووە رابەری راپەڕینێك کە پێش کاتی خۆی هەڵگیرسا.

لە رۆژی چواردەی شوباتدا شێخ سەعید و لایەنگرانی کە ژمارەیان گەیشتە دە هەزار کەس، دەسەڵاتیان بەسەر شاری گەنجدا گرت[*].

هەروا والی و کاربەدەستە تورکەکان بەدیل گیران و فەقێ حسان کە سەرۆکی خێلی مودان بوو کرا بە والی گەنج و یاسایەکی نائاسایی دەرکرد و، بەپێی ئەو یاسایە شاری گەنجی کرد بە پایتەختی کاتیی کوردستان و هەموو کوردێکیش لەپێناوی باوەڕدا بە تێکۆشەر دادەنرێن و، هەموو دەسەڵاتێکی ئایینی و دنیایی کەوتە دەستی شێخ سەعید و پێویست کرا گشت باج و کوێلەکانیش بۆ گەنج رەوانە بکرێن[*].

---

(*) M. S. Firat Dosu illrei ve yarto tarihi s. 132.

(*) M. N. Dersimi, Kurdistan Tarihinde Dersim. S. 177.

(*) M. N. Dersimi, Kurdistan tarihinde Derdim S. 177.



راپەڕیوەکان بانگەوازێکیان بڵاوکردەوە و باجی ((      ))[*] کە زۆر چارەگران و قورس بوو بەسەرشانی هاونیشتمانییەکانەوە، لایان برد و داوایان لە دانیشتوان کرد لەجیاتی ئەوە ئازووقە و شتی وا بۆ شۆڕشگێڕان بنێرن، ئەم کارەش لەلایەن کۆمەلانی خەڵکی جوتیارەوە پەسەند کرا و بەشی زۆریان لەدژی کاربەدەستە تورکەکان دەستیان دایە چەك[*]. لە ماوەیەکی کورتدا راپەڕینەکە لە خاکێکی فراواندا تەنییەوە و چوار ولایەتی رۆژهەڵاتی گرتەوە[*].

ئەو هۆیانەی لە سەرەتاوە بوونە هۆی سەرکەوتنی راپەڕینەکە گەلێکن، ناخۆشی رێگاوبان و زۆری دۆڵەکان بوونە یاریدەدەری شۆڕشگێڕان و هەر لەو کاتەشدا گەلێك گیروگرفتی گەوەریان خستە پێش جوولانەوەی سوپای تورکیا.

هەروەها شێوەی پێکهاتنی نەتەوەیی ئەو ناوچانەی راپەڕینەکەیان تێدا روویدا لە قازانجی راپەڕیوەکان بوو. بۆ نموونە لەو ولایەتانەی کە شۆڕشگێڕان دەستیان بەسەرداگرتن شەش سەد هەزار کورد هەبوون. واتە سێ هێندەی ژمارەی تورکەکان دەبوون، وێڕای ئەوەش سەد هەزار چەرکەسی لەو ناوچەیەدا دەژیان. ئەمە سەرەڕای کەمایەتییەکی عەرەبی و

---

(*) لە چاپی عەرەبیدا وشەی ناو دوو کەوانەکە نە نووسراوە- ج. د.

(*) س-س ئەفا ناسیف باری کەمە نەتەوایەتییەکانی تورکیا- یەریڤان ١٩٦٣.

(*) S. S. Aydemir, Ikrnci Adim. Ismet Inunu Cilt I. Istanbul 1968. S. 308.

کەمایەتییەکی ئەرمەنی. شایانی باسە رۆڵەکانی ئەم کەمە نەتەوایەتییانـە شۆڕشگێڕەکانیان خۆش دەویـست و زۆریـشیان بـە چـەکەکانیانەوە چـوونە پاڵیان. شان بە شانی ئەوان لە دژی ئەو چەوسانەوەیە دەجەنگین کە لەلایەن کاربەدەستانی تورکیاوە تووشی هاتبوون. ئەم هۆیانە هەموویان لەسەرەتاوە ببوونە یاریدەدەری سەرکەوتنی بزووتنەوەکە.

ئارمسترونغ لەم بارەیەوە نووسیویەتی و دەڵێ:

((راپەڕینەکە لـە کوردسـتان و ولایەتـەکانی رۆژهـەڵات هەڵگیرسـابوو. هەروا هەڕەشەی لە ناوچـەکانیتریش دەکـرد و تـەخت و بـەختی کۆمـار هاتبووە لەرزە(*).

(*) H. C. Armstrong Geey Wolf. Mustafa Kemal. London. 1934. P. 264.

## بەڕێوەچوونی راپەڕینەکە

لە ناوەڕاستی شوباتی ١٩٢٥دا، شێخ سەعید پەلەکانی حاجی حەسەن و عومەر فارۆ هەروا هۆزی مستان و بۆتانی لە خوارووی چیایا جۆرا رابەرێتی کردو لە رۆژی بیستەمی ئەم مانگەدا دەسەڵاتی بەسەر لیجەوخانی داگرت و هێزەکەی سالح بەگ (خەڵکی خانی) هاتە پاڵی و شێخ بە دۆڵی خانیدا بەرەو دیاربەکر کەوتەڕێ و لە رۆژی بیست و هەشتەمی شوباتدا و لە دەوروبەری شاری دیاربەکر هێزێکی گەورەی شێخ شەمسەدین هاتە پاڵی و هەر لەو کاتەشدا لە بیست و نۆیەمی شوباتدا شێخ عەبدولرەحیمی برای شێخ سەعید لە ناحیەی مادن (لە ولایەتی ئالی عەزیز) رابوو، بەڵام شێخ ئەیوب لەگەڵ ٥٠٠ جەنگاوەردا لە چرمێك (لە ولایەتی دیاربەکر) هاتە پاڵ شێخ عەبدولرەحیم و لەوێوە بەیەکەوە بەرەو ئەرگانی هاتن. لە رۆژی بیست و هەشتەمی شوباتدا شاری تالا بووە بارەگای شێخ سەعید و سوپای کورد کە ئەو کاتە ژمارەی گەیشتە بیست هەزار سەرباز، لێرەشەوە دەنگوباسیان لەو هێزانەی کوردەوە بۆ دەهات کە لە ماردین و ئەرگانی و مادن لە کاردا بوون.



لێرەدا دەبێ ئەوەش بڵێین کە سەرکەوتن و پێشکەوتنی کوردان لە ئەنجامی هێرشێکی رێکوپێکی هێزی سوپاییەوە نەبوو. شێخ سەعید خۆی رابەرێکی سوپایەکی رەسمی نەبوو بەڵکو رابەری پەلەکانی هۆزەکانی کورد بوو کە راستەوخۆ سەرکردەیی دەکردن و هەر چەندە کوردەکان ببزوتنایەوە ئەوەندەش دانیشتوانی ناوچەکان دەچوونە پاڵیان و هەر شوێنێکی دانیشتوان دەستیان بەسەردا بگیرایە بەڕێوەبەرێتییەکی نوێی تێدا پێکدەهات ئەگەرچی ئەم بەڕێوەبەرێتییە هەموو کاتێك وانەبووە کە پێویستە، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ سەرنجی ئەم خاسیەتە بدرێ، هەر لە سەرەتای هەڵگیرسانی راپەڕینەکەوە تا ئەو رۆژەی لە سێی مارتی ١٩٢٧ دا عیسمەت پاشا دەسەڵاتی گرتە دەست. کوردەکان لە ڕووی سەربازییەوە بەهێزتر بوون، ئەمەش بە ئاشکرا ئەوە دەردەخا کە دانیشتوانی ناوچە رزگارکراوەکان شێخ سەعیدیان خۆش دەویست و لایەنگیری بوون. شێخ سەعید داوای دەکرد ئایین لە فەرمانڕەوا کافرەکانی ئەنقەرە رزگار بکرێ. بەم کارەش ئامانجی راستەقینەی راپەڕینەکەی لە جەماوەری فراوان دەشاردەوە کە دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردبوو، کە پایتەختەکەشی دیاربەکر بێ. ناتەواوییەکی جەوهەری سیاسەتەکەی شێخ سەعید ئالێرەدابوو. گەلێك لە رابەرانی کورد بایەخێکی تەواویان نەدایە داخوازییە ئایینییەکەی شێخ سەعید و هەروا حەزیان نەدەکرد لە پێناوی ئاییندا بچنە جەنگەوە.

سەرکردەکانی کورد دەیانویست پاش رزگارکردنی دیاربەکر دانانی دەوڵەتێکی سەربەخۆیی کورد ئاشکرا بکەن، بەڵام دیاربەکر رەوتی جەنگەکانی بۆ قازانجی کاربەدەستە تورکەکان گۆڕی.

شێخ سەعید هەستیکرد کە هێزەکانی دەستگرتن بەسەر دیاربەکردا بەش ناکات، جا بۆ ئەوەی سوود لەکات وەربگرن لەگەڵ دەستەلاتداری دەستی بە وتووێژ کرد بۆ ئەوەی هاونیشتمانییە کوردەکان لەناو شارەوە بتوانن راپەڕن، بەڵام کاربەدەستانی دیاربەکر کە ئەو کاتە عەلی جەمال (میرداجی) پارێزەر بوو. کازم پاشا لە شارا فەرماندەی سوپا بوو (ئوربای) سەرۆکی کەنیسەش مورسل پاشا بوو هەموو نوختە گرنگەکانی شاریان گرت و چاوەڕوانی یارمەتییان دەکرد. کاربەدەستان چەکیان بەسەر دانیشتواندا دابەشنەکرد و سوپا بە تەنیا ئەرکی پاراستنی شارەکەی گرتە ئەستۆ، جا لەبەر ئەوەی کاربەدەستان قایل نەبوون شار بدەن بەدەستەوە، شێخ سەعید لە سەرەتای ئاداردا بڕیاریدا پەلاماری شار بدا.

تیپە چەکدارەکانی کورد کە بە تفەنگی راو و تفەنگی ماوزەر چەکدار بوون و هەندێکیان چەکی دەستیان گالوك بوو هەوڵیاندا بچنە ناو شارەوە و لە شەوی یانزەی ئاداردا تیپێکی هەڵبژاردەی جەنگاوەران لە دەرگای ماردینەوە بۆ ناو شار نێردران و چوونە پاڵ لایەنگرانی شێخ کە لەگەڵ هێزەکانی تورکیادا بەیەکدا هاتن، بەڵام هێزەکانی تورکیا بەسەریاندا زاڵبوون. جەنگاوەرانی کورد هاواریان ئەکرد (بژی سەربەخۆیی، بژی کوردستان). لە شەڕێکی سەختا کە هێزەکان



هاوسەنگی یەك نەبوون سەد و پەنجا کورد شەهید کران و ئەوانی تریشیان لەناو تاریکایی شەوا لەشار دەرچوون. هەندێکیشیان گەڕابوونەوە بۆ ماڵەکانیان لە شاردا.

دوای ژێرکەوتنی شێخ سەعید لە دەستەلات گرتن بەسەر دیاربەکردا، فەرمانی بە هێزەکانیدا کە بگەڕێنەوە، رۆژ بە رۆژ وەزعی هێزەکانی خراپتر دەبوو. لە باکوورەوە چل هەزار سەرباز و لە باشوورەوە سی هەزار سەرباز لە هێزەکانی حکوومەت گەمارۆیان دابوون و ئەو کاتە شێخ کۆششێکی بێ ئەنجامی دەکرد کە سەرکردە کوردەکان کۆ بکاتەوە و هەموو توانایەکی یەدەگی بە شەری و ماددی بۆ چاك بوونی بارودۆخی راپەڕینەکە بخاتە کار. شێخ سەعید لە نامەیەکدا بۆ شێخ عەبدولڕەحمان و شێخ ئیسماعیلی برای نووسیوە دەڵێ:

((رۆژی هەینی لە سەعات چواردا نامەکەتانم پێگەیشت کە رۆژی ١٩ی شەعبان (١٥ی ئاداری ١٩٢٥) نووسیووتانە. هەروا نامەیەکی شێخ محەمەد رەشیدی لەگەڵ بوو، گوتووتانە بۆزان ئاغا و شێخ ئەیوب هاتوون بۆ کارانج و دەتانەوێ هەروا منیش بگەمە ئەوێ. حەزم دەکرد سەرتان لێبدەم، بەڵام هەر ئێستا رەشید ئاغام لەگەڵ سەد سوارە بۆ بەرەی رۆژهەڵات نارد و ئەمرۆش چاوەڕوانم-خوا بیکات- عەشیرەتی نیرگیان بگات و ئەوانیش بۆ بەرەی شەڕ دەنێرم و هەروا تایەر و شێخ سەراجم نارد بۆ ناوچەکان تا ورەی جەنگاوەران بەرز بکەنەوە و هێشتا نەگەڕاونەتەوە. دوای گەڕانەوەیان هەندێ کاروباری پێویست جێبەجێ دەکەم و دێم بۆ

ناوچەکانیان بۆ قسە و باس لەگەڵ بوزان ئاغا و شێخ ئەیوب، ئێوەش دەبێ ئارام بگرن و جەنگاوەران دەبێ لە سنووری شەریعەتی ئیسلامیدا بجولێنەوە و دوورکەونەوە لە تالانکردنی ماڵی موسلمانان، بەڵام هەروەك لە نامەی پێشوودا باسمکردبوو لە کاتی زۆر پێویستیدا ئازووقە و یارمەتی لە عەمبارەکان وەرگرن و پسوولەیەکیان بدەنێ کە وەرتانگرتووە تا لەپاشدا یان بە ماڵ و یاخود بە پارە بیاندەینەوە)).

### خزمەتکاری جەنگاوەران

### محەمەد سەعیدی نەقشبەندی(*)

بەڵام بە هەوڵ و کۆششی رابەرانی راپەڕینەکە نەیانتوانی هێرشی هێزە زاڵەکانی تورکیا راگیر بکەن.

لەم کاتەدا هێزەکانی تورکیا لە دەوروبەری دیاربەکر نزیك دەبوونەوە و هێزەکانی شێخ سەعیدیش بەرەو دۆڵەکانی خانی دەکشانەوە، ئالێرەدا هێزەکەی شێخ عەبدولرەحمان کە لە ئەرگانی بەزی بوون هاتنە پاڵیان و پاش بەرگری کردنێکی کورت راپەڕیوەکان ناچاربوون بۆ داراهینی پاشەکشە بکەن و لەوێش بوونە چەند کۆمەڵێك و لە دارستانەکانی گەنج و پالۆو چەبەق چوور خۆیان شاردەوە، شێخ سەعیدیش لەگەڵ شێخ و سەرۆك

(*)"Hksam" 27, 4. 1925.



خێڵەکان لە داراخانی دەرچوون و لە ٢٧ی ئاداردا گەیشتنە چەبەق چوور لەوێ چاوەڕوانی هاتنی عەبدوڵڵا و شیفی و شێخەکانی تری ئال عەزیز و فارتو و کیفییان کرد(*).

لە ٢٦ی ئاداردا هێزەکانی تورکیا هێرشێکی توندیان کردە سەر ناوچەکانی دیاربەکر و فارتو و عەزیز بەو هۆیەوە فەیلەقێکی لەشکری یەکەمی تورکیا گەیشتە ناو شاری فارتوو، سەرکردە تورکەکان دەیانویست لەهەر چوارلاوە دەوری راپەڕیوەکان بگرن و رێگەی گەیشتنە عێراق و سوریا و ئێرانیان لە روو دابگرن(*). یەکێ لەو هۆیانە کە یاریدەی سوپای تورکیایاندا کە بتوانن پێشکەون ئەو ئاژاوە و تالانکارییە بوو کە لەناو شاری ئال عەزیز و شارەکانیتردا روویدا بوو، سەرەڕای ناکۆکی نێوان رابەرانی کورد و رۆیشتنی هەندێکیان و هەندێك لە سەرۆکی خێڵەکان بۆ پاڵ تورکەکان (بەتایبەتی خێڵەکانی ئال عەزیز)، بۆ نموونە نەجیب ئاغای سەرۆکی خێڵ لە (ئورفا) و بەگەکانی ئال عەزیز و هەروا خێڵەکانی رۆژهەڵاتی دەرسیم وەك خەفیران و لولان و ئەبزولان و سۆران بە سەرۆکایەتی رابەری ئایینی دوغان دیۆئوغلو حسێن کە لەگەڵ تورکەکان هاوکاری کرد و ناپاکی لەگەڵ بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد کرد و لە پشتەوە لە هێزە راپەڕیوەکانیدا کە لەگەڵ شێخ سەعید بوون و لە ئەنجامدا راپەڕیوەکان ناچاربوون لە یەکی نیساندا بەرەو

(*)M. S. Firat, Qsgn, iheri ve Varto tarihi S. 134.

(*) S. S. Aydemir, T. Adam. Mustafa Kemal Cilt 3, S. 226.

ئـالۆ(*) بکـشێنەوە کـە هێـزە حکوومییـەکانی کـازم پاشـای لێ نزیـك بووبوونەوە. زۆربەی زۆری کوردەکان (نزیکەی پێنج هەزار کەس) کـشانەوە بۆ دۆڵی میند و بۆسەیەکیان بۆ کەتیبەی پێنجەمی نازم پاشا نایەوە و لـە رۆژی سێی نیساندا شەریکی سەخت قەوما و یەك رۆژی تـەواوی خایانـد و پەلە کوردەکان شەڕێکی زۆر ئازایانەیان کرد، بـەڵام ناچـاربوون لـەو دۆڵـە بکـشێنەوە و بـۆ دارسـتانەکان پـەنا بـەرن، بـەڵام شـێخ شـەریف لەگـەڵ پیاوەکانیدا رووی کردە چیایاجۆرا تا بگاتەوە پاڵ شێخ سەعید و لە شەشی نیساندا هێزەکانی حکومەت گەیشتنە چەبەق شوور. بۆیە شـێخ سـەعید و هاوکارانی کە ژمارەیان سێ سەد سـوار دەبـوون ناچـار بـوون بـۆ سـوڵخان پاشەکشە بکەن، خێڵی خۆرمیك پشتگیری کاربەدەستە تورکەکانیان کـرد. بۆ نموونە سەرۆکی ئەو خێڵە گوجوك محەمەد خولیوس ئەفەنـدی سـێ سـەد چەکداری خستە ژێـر دەسـتی تورکەکانـەوە لـەدژی راپـەڕیوەکان و عـەلی کەمالی برایشی سەد سوارەی بۆ تورکەکان تـەرخانکرد. هێزەکـانی تـورك لەگەڵ ئەو خێڵانەی پشتگیرییان دەکردن توانییان هێـزی کـوردان ببـەزێنن بەتایبەتی خێڵی جبران لە دۆڵی کارلیۆف و هەردوو سەرۆکی ئەو خێڵە بابۆ و حتۆ لەگەڵ پەنجا سوارەدا بۆ ناوچەی سون کشانەوە و لە عەشـق مەیـدان گەیشتنەوە هێزەکانی شێخ سەعید.

---

(*) M. N. Dersimi, Kurdistan tarihinde, dersim, s. 187.

سەرکردەکانی تورك بۆ ئەوانەی یارمەتی هێزەکانی حکومەتیان دابوو. بۆ سەرۆکەکانی خێلی خۆرمیك و دانیشتوانی کیفی پیرۆزباییان نارد و بروسکەی مستەفا کەمالی سەرکۆمار درایە زوخت کە والی ئەرزرۆم بوو. هەروا کازم کە چاودێری سوپای سێیەم بوو، لەگەڵ عوسمان نوری کە سەرکردەی هێزی یانزەیەم بوو(*).

لە کۆتایی ئاداری **١٩٢٥** دا خالد حەسەنان و عەلی رەزا و خالد جبری و رابەرانی تری کورد لەگەڵ هەزار سوارەدا ناچاربوون دوای ژێرکەوتنی هێرش بۆ سەر خەنس بەرەو رۆژهەڵات بکێشنەوە(*).

ئا لەم کاتەدا هێزەکانی تورکیا لە کراکوس بە یارمەتی سەرۆکەکانی خێلی حەیدەران. کوردان ناچارکران بچنە جەنگێکی تازەی زۆر سەختەوە کە ئەوەبوو خالد حەسەنان و ئەوانی لەگەڵی بوون ناچاربوون لە سنوور دەرچن و رووبکەنە ئێران. حکومەتی ئێران بە ئاگر و ئاسن پێشوازی لە کوردە راپەڕیوەکان کرد، لە ئەنجامدا شەمسەدینی کوڕی خالد حەسەنان بەگ و عەباسی کوڕی شێخ سەعید و هەروا سەرۆکی خێلی زەرگان کرم و گەلێك لە راپەڕیوەکان شەهیدبوون و خالد حەسەنان بەگ و علی رەزاو ئەو جەنگاوەرانەی کەمانەوە چوونە پاڵ رابەری کورد سمکۆ(*).

---

(*) M. S. Firat, Dosu, illeri ve varto tarihi. S. 137-138.

(*) سەرچاوەی پێشوو ل ١٤٣ — ١٤٥.

(*) M. N. Dersimi, Kurdistan tarikinde Dersim. S. 178-179.



هۆی ژێر کەوتن و پاشەکشەی کوردەکان لە هەموو ناوچەکاندا لەپێش هەموو شتێکدا ئەوەبوو کە حکومەت لەبارەی بەڕێوەبەری و سیاسی و سوپاییەوە بۆ ریشەکێشانی راپەڕینەکە بە چاکی خۆی ئامادەکردبوو.

## ئەوکاروبارە یاساییی و سوپاییانەی کە فەرمانڕەوایانی تورك بۆ ڕیشەکێشکردنی ڕاپەڕینەکە بەجێیان گەیاند

بەپێچەوانەی پێشبینی کاربەدەستانی تورکیاوە، لەوەدا کە ڕاپەڕینەکە شتێکی وانییە، لە سەرەتاوە ڕاپەڕینەکە ولایەتەکانی ڕۆژهەڵات و خوارووی ڕۆژهەڵاتی وڵاتی گرتەوە، بەڵام ڕۆژنامەکانی تورکیا دوای چەند ڕۆژێك لەدەستپێکردنی ڕاپەڕینەکە هەندێ شتیان دەربارەی ئەوەی ناویان لێنابوو ((ڕووداوەکانی غەنەج)) نووسیبوو. جا هەرچەندە حکومەتی تورکیا ئاگاداری بزووتنەوەی کورد بوو لە ڕۆژهەڵاتی وڵاتدا، بەڵام ئەوەی لەبەرچاو نەبوو کە بەم شێوەیە گەورەبێ. هۆی ئەمەش ئەو دەنگوباسە گەشبینانەیە بوو کە ڕۆژنامەکانی تورکیا دەیان وتەوە و ئەو بەیاننامە ڕەسمییە داتاشراوانەی کە لە کاربەدەستانەوە دەربارەی ڕیشەکێشکردنی خێرایی ((بزووتنەوە کۆنەپەرستییەکەی شێخ)) دەرکرابوون. بۆ نموونە لە ١٨ی شوباتی ١٩٢٥ داو لە کۆبوونەوەی پەرلەمانی تورکیادا لە وەڵامی پرسیاری یەکێك لە نوێنەرەکاندا وەزیری ناوخۆ ڕایگەیاند کە ((لە غەنەج جەردەیەکی ڕێگر بەناوی شێخ سەعید پەیدابووە، لەگەڵ دەست و پێوەندەکانیدا ناوچەکە تالان دەکەن. بەڵام ئەو کاروبارەی توندوتیژی حکومەت بە زووترین کات لەناوی دەبات(*)).

(*) B. Cemal, Seyh Sait Isyani, Istanbul, 1955, S. 39.



جا بەم بۆنەیەشەوە دەتوانرێ باسی وتە دەربڕینەکەی ئەنیس بەگ بکرێ کە ئەو کاتە کاورباری تورکیای لە مۆسکۆ بەڕێوەدەبرد و گوتی: ((......ئەم بزووتنەوەیە بۆ حکومەتی تورکیا مەترسییەکی نییە و باری وڵات تێکنادات. شێخ سەعید لەژێر پەردەی دروشمی ئاینیدا هەستاوە. لەبەر ئەوە دەنگونجێ هەندێ کۆنەپەرست لە تورکیادا هەبن لەگەڵ بزووتنەوەکەی شێخ سەعید بن، بەڵام کۆمەڵانی خەڵك لەم بزووتنەوەیە دوورن و من هیچ گومانم لەوەدا نییە کە ئەم بزووتنەوەیەش ڕیشەکێش دەکرێ، هەروەك چۆن ساڵی پار ڕاپەڕینەکەی خێلی ئابوور ڕیشەکێش کرا(*)).

بەم چەشنە بەیاننامە و وتە دەربڕینی ڕەسمی تورکەکان وەکو ئاشکرایە زۆر گەشبینانە بوون سەبارەت بە دوایی هاتنی خێرایی ڕووداوەکان لە ڕۆژهەڵاتی وڵاتدا و هەر لەو کاتەشدا هەستیان بە مەترسی وەزعەکە کردبوو. لەبەر ئەوە پەنایان بۆ بەجێگەیاندنی هەندێ کاروباری پێویست بردبوو بۆ ڕیشەکێش کردنی ڕاپەڕینەکە.

لە درەنگە شەوی ٢٢ و بەرەبەیانی ٢٣ی شوباتدا ئەنجوومەنی وەزیرانی تورکیا کۆبوونەوەیەکی لەناکاویان بە سەرۆکایەتی سەرکۆمار و بە بەشداریکردنی سەرۆکی ئەرکان فەوزی پاشا (چەقماق) بەست و لەو کۆبوونەوەیەدا باری نائاسایی بڕیاردرا و ناوچەی ڕاپەڕینەکەیان بۆ ماوەی مانگێك خستە ژێر حوکمی عورفییەوە و ئەنجوومەنی گشتی تورکیاش ئەو

(*) ((بەرەبەیانی ڕۆژهەڵات)) ١-٣-١٩٢٥ (بە زمانی ڕووسی).

بڕیارەی پەسەند کرد و لەو بڕیارەدا وتراوە: ((ئەو ڕاپەڕینەی لەدژی هێزە چەکدارەکانی تورکیا لە بەشێکی ولایەتی ئەرغانیدا ڕوویدا و دیاربەکر و ئال عەزیز و غەنەجی گرتەوە توانای هەیە پەرەبسێنی، بۆیە حکومەت بڕیاریدا باری نائاسایی لە ولایەتەکانی موش و ئەرغانی و دەرسیم و دیاربەکر و ماردین و ئورفە و سیعزك و سیرت و بەدلیس و وان و هەکاری و هەروا لە ناوچەکانی کیفی و خەنس لە ولایەتی ئەرزەڕۆم بڕیار بدات(*).

لە ڕۆژی **٢٤**ی شوباتدا کۆمەڵێك لە نوێنەرانی حزبی کۆماریی گەل کۆبوونەوەو فەتحی بەگی سەرۆکی حکوومەت و جەمیل بەگی وەزیری ناوخۆ، دەربارەی ڕووداوەکانی غەنەج وتاریان خوێندەوە و فەتحی بەگ ئەمجارە بە ((جەردە و ڕێگر)) ناوی دەربردن، بەڵکو ئەوەی دووپات کردەوە کە ((ڕاپەڕینەکە سروشتێکی کۆنەپەرستانەی هەیە)) هەروا ڕایگەیاند کە شێخ سەعید بۆ دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ و پەیڕەوکردنی شەریعەت و دانانی خەلیفایەتی و داوای خەبات لە پێناوی ڕووخاندنی ڕژێمی خوانەناسی ئێستادا هەوڵدەدات(*). هەموو قسەکەرانی کۆبوونەوەکە دووپاتیان کردەوە کە ڕاپەڕینەکە کۆنەپەرستانەیە و پێش هەموو شتێك ئەنجامی ((ئایین پەروەریی کوێرانەی کوردەکانە)) و بە هاندانی دەوڵەتانی بێگانەیە.

(*)"Hakimiyeti Milliye", 24.2.1925.

(*) M. Toker, Seyh Sait ve Isyani, S. 22.



لە پاش گفتوگۆکردن لەسەر وەزعی ڕۆژهەلاتی ولات، مەحموود عیزەت بەگی وەزیری دادپەروەری پڕۆژەی یاسایەکی خوێندەوە کە پێشکەش بە حکومەت دەکرێ و ئەم شتانەی تێدا بوو:

١- هەموو کاروکردەوەیەك کە چ بەردەوامی یان بە نووسراوی هەوڵدەدا هەستی ئایینی گەل بۆ ئامانجی سیاسی بەکاربێنی، بەتاوانێك لە دژی نیشتمان دادەنرێت.

٢- هەرکەسێك بەدەمی یان بە نووسراو بۆ پێکەوەنانی کۆمەڵە ئایین بەکار بێنێ یان وتار بلاوبکاتەوە و ئایین بۆ ئامانجی سیاسی بەکاربێنی، هەموو ئەم چەشنە کارانە بەخیانەتی هەرە گەورە دادەنرێن.

٣- زۆربەی زۆری نوێنەرانی حزبی کۆماریی گەل داوایان کرد ئەم پڕۆژەی یاسایە بڕیار لەسەر بدرێت، ئەوەبوو بە تەواوی دەنگەکان لەلایەن نوێنەرانی ئەم حزبەوە پەسەندکرا(*).

٤- لە بیست و پێنجی شوباتدا ئەنجوومەنی گشتی لە پەرلەمانی تورکیادا مادەی ژمارەیەکی یاسای سزادانی دەربارەی خیانەتکردن لە نیشتمان کە لە ١٥ی نیسانی **١٩٢٣** دا

(*) "Istanbbul" 25.2.1925.

دانرابوو دەستکاریکرد (یاسای ژمارە ٥٥٦) ئەو مادەیەی گۆڕدرا. دوای دەستکاری کردنەکە بەم چەشنەی لێهات:

دامەزراندنی ڕێکخراوی سیاسی لەسەر بناغەی ئایینی قەدەغەیە. هەروا بەکارهێنانی ئایین لە پێناوی هێنانەدی ئامانجی سیاسیدا و ئەو کەسانەی ئەم جۆرە کردەوانە بکەن، یان ببنە ئەندامی ئەم ڕێکخراوانە بە خائین دادەنرێن(*).

شایانی باسە کە فەرمانڕەوایانی تورك هاوبیروڕا نەبوون لە هەڵوێستدا دەربارەی سیاسەتی ناوخۆ، بەتایبەتی سەبارەت بە ریشەکێشکردنی بزووتنەوەکەی کورد، سەرنج دەدرا کە هەڵوێستی حزبی کۆماریی گەل و کۆماریی پێشکەوتنخواز لێك جیاوازبوون. هەروا لەناو حزبی کۆماریی گەل خۆشیدا جیاوازی هەبوو، لەم حزبەدا سێ پارچە هەبوون: مام ناوەندەکان و نەتەوە پەروەرە دەمارگیرەکان و ((چەپڕەوەکان)). فەتحی بەگ سەرۆکی مام ناوەندەکان و عیسمەت پاشا سەرۆکی نەتەوە پەروەرە دەمارگیرەکان بوون، بەڵام چەپڕەوەکان ((رادیکالییەکان)) مەحموودی عیزەت پاشا لەلایەن مستەفا کەمالەوە لایەنگیری دەکرا.

نەتەوە پەروەرە دەمارگیرەکان کە لە سەرۆکایەتی حزبدا زۆربەبوون هەلێکی لەباریان دییەوە بۆ دوورخستنەوەی مام ناوەندەکان لە حوکمڕانی، هەروا بۆ داپلۆسینی ((پێشکەوتنخوازەکان)) ڕاپەڕینەکەی شێخ سەعیدیش

(*) "Dustur" Lill . 6.5.107.



هەلێکی زۆرباش و لەباربوو. فەتحی بەگ پێش هەموو شتێك وا تاوانبارکرا کە بەرامبەر ڕاپەڕینەکە کەمتەرخەمی کردووە و بە هۆی هەڵوێستی گەشبینانەی لە هەڵسەنگاندنی قەبارەی بزووتنەوەکە و مەترسییەکەیدا، هەروا بەهۆی شل و شۆڵییەوە لە هەڵبژاردنی هۆیەکانی ریشەکێش کردنیدا کەوتە بەر رەخنە و هێرشەوە، تەنانەت لە سەرەتای ڕووداوەکاندا وا سەرنجدرا دیاردەیەکی ئاسایی لێرەدا هەیەو، بەشێك لە ئەندامانی حزبی کۆماریی گەل نەك هەر پەنایان نەبردەبەر بێ دەنگ بوون و کەمکردنەوە لە قەبارەی بزووتنەوەکەی کورد و بەس بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەوانە توانای بزووتنەوەکەیان زۆر بە گەورەتر دەخستە پێش چاو، ئەو هەڵوێستەش کە لەسەرەتاوە لە سەرکردایەتی حزبی کۆماریی پێشکەوتنخوازدا گیرایەبەر پێشبینی نەدەکرا. لەجیاتی ئەوەی ڕێوشوێنی تاقیکراوەی پێشوو بگیرێتە بەر لەوەدا کە لە پێناوی رەخنەگرتن لە حکومەتدا هەر گیروگرفتێك بکرێتە مژڵەت و ئەم جارەش مەسەلەکە زۆرباش و لەباربوو، بەڵام ((پێشکەوتنخوازەکان)) ڕاستەوخۆ ڕێبازی پشتگیری تەواوی حکومەتیان گرتەبەر، نەك هەر سۆزێکیان بەرامبەر ڕاپەڕینەکە پێشاننەدا بەڵکو بۆ ریشەکێش کردنی بزووتنەوەکە بازووی خۆشیان پێشانداو ڕابەرانی حزبی کۆماریی پێشکەوتنخواز لایەنگیری ئەو کاروبارەیان کرد کە لەلایەن حکومەتی فەتحی بەگەوە پێشنیارکرابوو. لە ئەنجوومەنی تورکیدا کەوتنە وتاردان و لە ڕۆژنامەکانیشدا بانگەوازیان لە دژی ڕاپەڕینەکە بڵاوکردەوە و پەیمانی پشتگیری تەواویان تێدا دایە حکومەت.

کازم قەرەبەکر پاشا بەناوی حزبی کۆماریی پێشکەوتنخوازەوە قسەی کرد و ڕێکەوتنی خۆی لەگەڵ حکومەت ڕاگەیاند لەوەدا کە خائینانی نیشتمان لەوانەی کە ئایین بۆ مەبەستی سیاسی بەکاردێنن بکرێن بە چەند بەشێکەوە و هەروا ڕایگەیاند کە هەر مەترسییەك لە ناوەوە یان لە دەرەوە لەگەڵ ڕۆڵەکانی ئەم نیشتمانەدا ڕووبەڕوودەبێتەوە و هەموو وەك یەك پیاو بەرهەڵستی دەکەن[*].

کۆمیتەی ناوەندی حزبی کۆماری پێشکەوتنخواز بۆ لقەکانی حزب لە ویلایەتەکاندا بروسکەی نارد و داوای لێکردن کە بزووتنەوەکەی شێخ سەعید بە بزووتنەوەیەکی کۆنەپەرست دابنێن، ئەوەی دووپات کردەوە کە حزب باوەڕەکانی ئەم بزووتنەوەیە پەسەند ناکات[*].

هەر لەو کاتەشدا تەواوی ڕۆژنامە بەرهەڵستکارەکان لەسەر لاپەڕەکانی خۆیان دەنگوباسی هێدی و هێمنیان لە ناوچەکانی ڕاپەڕینەکەوە ڕادەگەیاند و بەئاشکرا لە قەبارەی ڕاپەڕینەکەیان کەمدەکردەوە. ئەم جۆرە تەکتیکەی حزبی کۆماریی پێشکەوتنخواز ئەوەی دەردەخست کە نەك تەنیا حەز لە دوورکەوتنەوە لە بزووتنەوەی کورد دەکات بەڵکو بۆ مەبەستی بەرگریش ئەوە دەکات، بێگومان ڕابەرانی حزب نیازی لایەنگرانی حزبەکەی عیسمەت ئینۆنۆش ئاگاداربوون کە دەیانویست سوود لە ڕووداوەکانی

(*) "Tanin". 27.2.1925.

(*) B. Cemal, Seyh Sait Isyani. S. 47.



ڕۆژهەڵاتی وڵات وەربگرن بۆ لەناوبردنی هەمیشەیی بەرهەڵستکارەکان کە سەریان بەرزکردبۆوە[*].

لایەنگیری حکومەت لەلایەن بەرهەڵستکارەکانەوە لە ناخۆشترین هەلومەرجدا، لای بەشێکی لابالێی مام ناوەندی لەناو حزبی کۆماریی گەڵدا باری سەرنجێکی زۆرگەورەکراوی خولقاندبوو سەبارەت بە گومانکردنی نادروست بەرانبەر بەرهەڵستکارەکان، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی فەتحی بەگ لە هەوڵ و کۆششی حزبی کۆماری پێشکەوتنخوازدا ڕاست و دروستی ڕێبازەکەی خۆی بەرانبەر بەرهەڵستکاران ببینی. بەڵام زۆربەی زۆری حزبی کۆماریی گەل هەڵوێستێکی تریان گرتەبەر و وایان تەماشای هەڵوێستی بەرهەڵستکارەکان دەکرد وەك مانیورێك بێت بۆ دەست خستنی سۆز و لایەنگیری خەڵکی لە وڵاتدا.

لەبەر ئەمە و بەپێی ئامۆژگاریی مستەفا کەمال، فەتحی بەگ لەگەڵ سەرۆکەکانی حزبی کۆماری پێشکەوتنخوازدا دەستی بە گفتوگۆ کرد و ڕاوێژیکردن کە حزبەکەیان هەڵوەشێننەوە. هۆی ئەمەش ئەو ڕەخنە توندوتیژە بوو کە لابالی نەتەوە پەروەرە دەمارگیرەکانی ناو ئەم حزبە لەدژی حزبی کۆماریی پێشکەوتنخواز دەستیان پێکردبوو، وایان

(*) وا باشە لێرەدا ئەوەش باسبکەین کە پاڵێوراوانی حزبی کۆماریی گەل لە هەڵبژاردنی بەڕێوەبەرێتیدا لە هەموو شارەکاندا دەرنەچوون: لە شارەکانی (سمون، ئەسکیشەهر، سواس و مرسین)دا پاڵێوراوانی حزبی کۆماریی پێشکەوتنخواز و ((سەربەخۆیەکان)) دەرچوون.

تاوانباردەکردن کە کوردەکانیان بۆ ڕاپەڕین هانداوە، بەم بۆنەیەوە دەبێ ئەوەش بوترێ کە ئەم حزبە هیچ پەیوەندییەکی بەو ناوچانەوە نەبوو کە ڕاپەڕینەکەیان تێدا هەڵگیرسابوو. هەروا هیچ جۆرە پەیوەندییەکی ڕێکوپێکی و شەخسی لەگەڵ ڕێکخەرانی ڕاپەڕینەکەدا نەبوو، بەڵام لایەنگرەکانی هەڵوەشاندنەوەی حزبی کۆماریی پێشکەوتنخواز بە هەموو ڕێگەیەك هەوڵیان دەدا ئەو مادەیە لە پرۆگرامی حزبدا کە دەربارەی ڕێزگرتنی ئایین بوو بگۆڕن (مادەی شەشەم)(*). لەکاتێکدا بەپێی مادەی ژمارە (٢)ی دەستووری ساڵی ١٩٢٤ ی کۆماری تورکیا، ئایینی دەوڵەت ئیسلام بوو، واتە تورکیا دەوڵەتێکی ئیسلام بوو، ئەگەر مادەیەك دەربارەی ڕێزگرتنی ئایین لەناو پرۆگرامی حزبی کۆماریی پێشکەوتنخوازدا بوایە هیچ پێچەوانەی دەستوورەکەی ساڵی ١٩٢٤ نەدەبوو، بەڵام لەگەل ئەوەشدا هێشتا دوو هەفتە بەسەر بەرپابوونی ڕاپەڕینەکەدا ڕانەبوردبوو کە لە بیست و پێنجەمی شوباتی ١٩٢٥ دا فەتحی بەگی سەرۆکی وەزیران کازمی قەرەبەکر پاشای سەرۆکی حزبی کۆماریی پێشکەوتنخواز و عەلی فوئاد پاشای سکرتێری حزب و ڕەئووف بەگی بانگ کردبوو پێی گوتبوون: ((من ڕاسپێردراوم کە پێتان ڕابگەیەنم دەبێ حزبەکەتان هەڵوەشێننەوە، ئەگەر وانەکەن ئەنجامی خراپ دەبێ و خوێن دەڕێژرێ))، پاشان لەسەری زیادکرد و گوتی ((بەداخەوە کە لەم ڕووەوە قسەتان لەگەڵ دەکەم و هەروەك دەزانن

(*) T. Z. Tannaya, Turiciyede Syasi Partiler, Istanbul, 1925.5.6.



من لە دژی هەموو چەشنە کاوربارێکی ڕەگەزایەتیم)) ئینجا فەتحی بەگ شوێنی شلۆقی بۆ ڕوون کردنەوە کە گوتی دەترسم ببێتە کەمایەتی(*).

ئا بەم شێوەیە بە کردەوە مەسەلەی لەبەر یەك هەڵوەشاندنەوەی حزبی کۆماریی پێشکەتنخواز بڕیاردرا: ئەگەرچی بەرنامە و چالاکیشی پێچەوانەی دەستوور نەبوو، بەڵام تەنیا ئەوەبوو کە مستەفا کەمال و نەتەوە پەرستە دەمارگیرەکانی دەوروپشتی سووربوون لەسەر دیکتاتۆریی تاقە یەك حزبی بورژوای تورك.

گفتوگۆکردن هیچ ئەنجامێکی نەبوو چونکە ((پێشکەوتنخوازەکان)) قایل نەبوون حزبەکەیان هەڵبوەشێتەوە و سەرۆکی حزب کازم قەرەبەکر پاشا بە فەتحی بەگی ڕاگەیاند: ئەگەرچی ئێمە حزبمان دامەزراندووە، بەڵام تەنیا کۆنگرە دەسەڵاتی هەڵوەشاندنەوەی حزبی هەیە، ئینجا وتی حزبی کۆماریی پێشکەوتنخواز هەموو کۆششێکی حکومەت بۆ ڕیشەکێشکردنی ڕاپەڕینەکە پشتگیری دەکات(*)، بەڵام ئەم بەهانانە هیچیان سەرنەکەوتن.

لە ڕۆژی ٢ی ئاداری ١٩٢٥ دا و لە کۆبوونەوەی حزبی کۆماریی گەلدا، ڕەجەب بەگ (بەکر) وتارێکی داو ڕەخنەی لە سیاسەتی ناوخۆی فەتحی بەگ گرت. وتارەکەی نزیکەی سێ سەعاتی خایاند. ئامانجی ئەوەبوو پێویستی پەیڕەوکردنی کاروکردەوەی دڵڕەقانەتر بسەلمێنێ. فەتحی بەگ کاتی خۆی

(*) S. S. Aydemir, T. Adam. Mustafa Kemal, cilt, 3, Istanbul 1961, 5, 220.

(*) M. Toker, Seyh Sait ve Isyani, 5. 45.

کە بەرپەرچی رەخنەی وەزیری ناوخۆی پێشووی دایەوە گوتی: ((بەداخەوە ئەوەی رەخنەم لێدەگرێ خۆی سەبەبی پەیدابوونی گێروگرفتی کوردە، منیش بەکار و کردەوەی دڵرەقانە کە هیچ پێویست نییە دەستی خۆم بە خوێن سوور ناکەم))(*).

نوێنەرانی وڵاتەکانی رۆژهەلاتیش خۆیان لە کۆبوونەوەی حزبدا قایلبوونی خۆیان لەڕاستی ئەو کاروکردەوانەدا پێشاندا کە لەلایەن حکومەتەکەی فەتحی بەگەوە جێبەجێ کران. ئەوجا یەکێك لە نوێنەرەکان بەناوی کیلیج عەلی پێشنیاریکرد کە مستەفا کەمال پاشا بۆ بیروڕا دەربڕینی خۆی بانگ بکرێت. مستەفا کەمالیش خۆی داوای جێبەجێ کردنیکاروباری زۆر توندتری کرد، پاش قسەکانی مستەفا کەمال پاشا ئیتر دەرگای گفتوگۆکردن داخرا، پاشان پێشنیارێکی پێشکەشکرد کە کاروباری پێویست بۆ یەك لایی کردنەوە جێبەجێ بکرێت و دادگایەکانی سەربەخۆیی پێك بهێندرێن(*). لە هەلومەرجێکی ئاوادا و لە دووی ئاداردا وەزارەتی فەتحی بەگ دەستی لەکارکێشایەوە.

(*) S. S. Aydemir, Ter Adam, Mustafa Kemal, cilt 2, S-221.

(*) تەنیا نوێنەرێکی کوردەکان لەم وەزارەتەدا نەبوو، بەڵکو زۆربەی زۆریان لە ناوچەکانی ناوەوەو رۆژئاواوە بوون.



لە رۆژی ۳ی ئاداری ۱۹۲۵ دا عیسمەت پاشا وەزارەتێکی تازەی پێك هێنا(*).

عیسمەت پاشا لە وتارێکیدا کە لە پەرلەماندا خوێندییەوە بەرنامەی حکومەتەکەی راگەیاند: ((لە بواری سیاسەتی ناوخۆدا، لەپێش هەموو شتێکدا هەوڵدەدەین ڕووداوەکانی ئەم دواییە نەهێڵین و نیشتمان لە دەسیسە بپارێزین، ئەمن و ئاسایش و هێدیایەتی پارێزگاری بکەین و دەسەڵاتی دەوڵەت لە هەموو لایەنێکدا بەتین بکەین. ئەمەش بەیارمەتی بەجێگەیاندنی هەندێ کاروباری تایبەتی کە بە پێویست و باشیان دەزانین بۆ خۆمان))(*). رۆژنامەی ((هیکمتی میللی)) دەربارەی بەرنامەی وەزارەتە تازەکە نووسیویەتی دەڵێ: ((ئەم گۆڕینەی وەزارەت لە ئەنجامی جیاوازی مەبدەئییەوە نەبووە. بەڵکو سروشتێکی تەکنیکی هەیە. ئەمەش لە وتەکانی عیسمەت پاشادا سسەرنجی دەدرێ کە رایگەیاند لە کاروباری دەرەوە و ناوخۆدا لەسەر سیاسەتی پێشووەکەی دەڕوات لەگەڵ گۆڕینێکی کەم لە تەکتیکدا))(*).

بەپێی ئەم بەرنامەیە حکوومەتی تازە بۆ ریشەکێشکردنی راپەڕینەکەی شێخ سەعید - بزووتنەوەی رزگاریخوازیی کورد، کاروباری بەڕێوەبەری و

(*) M. Toker, Seyh Sait ve Isyani, S. 66.

(*) M. Toker, Seyh Sait ve Isyani, S. 69.

(*) "Hakimiyeti Milliye" 6-3-1925.

سوپایی و سیاسی بەجێگەیاند، زۆر بەخێرایی پڕۆژەی یاسایەکی بۆ پاراستنی رژێم ئامادەکرد و بۆ لێکۆڵینەوە و بڕیاردان پێشکەشی پەرلەمانی کرد، ئەم پڕۆژەیە لەلایەن هێزە بەرهەڵستکارەکانەوە بەرەنگاری کرا بۆ نموونە، نوێنەری دەرسیم فەرەیدون فیکری بەگ پڕۆژەی ئەو یاسایە پێشنیارکراوەی دایە دواوەو رایگەیاند:

((ئێمە یاسامان هەیە بۆ سزادانی هەر کەسێك کە ئاسایشی دەرەوە و ناوخۆمان تێکبدا ... لەبەر ئەوە پێشنیار دەکەم ئەم یاسایەی پێشنیاکراوە رەت بکرێتەوە))(*) هەروا کازم پاشای سەرکردەی بەرهەلستکاری لە دژی ئەم یاسایە راوەستاو بە پێچەوانەی دەستووری کۆماری تورکیای دانا(*).

بەڵام زۆربەی نوێنەران یاسایەکەیان بڕیاردا. بۆ نموونە رەجەب بەگی وەزیری بەرگری رایگەیاند کە هۆی پێشکەشکردنی ئەم یاسایەی کە پێشنیارکرا ئەوەیە رێز و حورمەت بۆ دەسەڵاتدارێتی بگێڕدرێتەوە، لەبەر ئەوە حکوومەت وای دەبینی کە پێویستە ((هەموو هێلانەیەکی پیاوخراپان لە هەر شوێنێکی وڵاتەکەماندا هەبن لەناوببرێن(*))).

دوای دەمەقاڵەیەکی توندوتیژی نێوان نەتەوە پەروەرە دەمارگیرەکان و لیبرالیەکانی بەرهەڵستکار، لە رۆژی ٤ی ئاداردا ئەنجومەنی گەلی

(*) "Istanbul", 5-3-1925.

(*) B, Cemal, Seyh SAit Isyani, S. 58.

(*) Tanin, 5-3-1925.



تورکیا یاسای ژمارە (٥٨)ی دەربارەی پاراستنی رژێم بڕیارداو بەپێی ئەم یاساییە دەسەڵاتی فراوان درا بۆ سنووردانان بۆ راپەڕینی میللی و هەموو هەڵسوڕانێکی بەرهەڵستکاری.

لەو یاسایەدا هاتووە: ((مادەی یەکەم، حکومەت خۆ بەخۆ دەسەڵاتی پێدراوە کە پاش پەسەندکردن لەلایەن سەرکۆمارەوە، لە دژی هەموو رێکخراوەکان و چالاکی و دەزگاکانی بڵاوکردنەوە کە سروشتێکی کۆنەپەرستانەیان هەبێ، یان ئەوانەی داوای یاخیبوون دەکەن یان هەر هەڵسوڕانێك کە زیان بە کۆمەڵ بگەیەنێ و هەر کاروکردەوەیەك هێمنایەتی و ئاسایشی وڵات تێکبدات)).

حکومەت مافی ئەوەی هەیە هەموو ئەو کەسانەی ئەم چەشنە کاروکردەوانەی سەرەوە دەکەن بدرێنە دادگای سەربەخۆیی(*).

ئەم یاسایە هەر لەکاتی بڕیاردانیەوە تا ماوەی دوو ساڵ کاری پێکرا، بەپێی ئەم یاسایە بە کردەوە هەندێك مافی دیکتاتۆرانە بە حکومەت درا کە تەنیا لەگەڵ سەرکۆماردا بەشیاندەکرد، ئەم یاسایە توانای ئەوەی دا هەموو کاروکردەوەیەکی داپڵۆسینی سەردەمی عورفی بەرین بکرێت. هەر کە ئەم یاسایە بڕیاردرا، عیسمەت پاشا پڕۆژەی یاسای دامەزراندنی دادگاکانی سەربەخۆیی خستە پێش چاوی ئەنجوومەن.

(*) ((Dustur)) Cilt 6-5-14-4.

سەرەڕای بەرهەڵستکردنی نوێنەرە ((پێشکەوتنخوازەکان)) ئەنجوومەن بڕیارێکی دەربارەی دامەزراندنی دوو دادگای سەربەخۆیی دەرکرد: یەکێکیان بۆ هەموو تورکیا کە بارەگای هەمیشەیی لە ئەنقەرا بوو. سنووری دەسەڵاتی بۆ دیاریکرابوو (حوکمی لەسێدارەدان دەرکردن بەپێی بڕیار و پەسەندکردنی ئەنجوومەنی گەلی تورکیا). دادگایەکی تریش لە ویلایەتەکانی رۆژهەڵات کە دەسەڵاتی بێسنووریان پێدرابوو.

هەندێك لە رۆژنامەکانی تورکیا ناچاربوون دان بەوەدا بنێن کە ئەم یاسایە نوێیە هەندێك مافی ئاوهای دابووە عیسمەت پاشا کە حکومەتی ئەنقەرە لە ماوەی خەبات لە پێناوی سەربەخۆییدا نەیبوو. رۆژنامەی ((وقت)) نووسیبووی: ((ئەگەر لە هەندێك مادەی ئەم یاسایە دەربارەی پاراستنی ئاسایش بکۆڵینەوە دەبینین ئەم مافانە تاڕادەیەك بێسنوورن...))(*).

بڕیاردانی ئەم یاسایانە بە کردەوە بووە هۆی پاکتاوکردنەوەی هەموو چالاکییەکی بەرهەڵستکاری کە لە ئازادییە بورژوازییەکاندا رێگەیان پێدرابوو لە دەستوریشدا ئاشکراکرابوون. هەروا بووە هۆی تاکڕەوی تاقە یەك حزبی کەمالییەکان.

هەر بەپێی ئەو یاسایانە بوو کە حکومەت داخستنی نزیك بە تەواوی رۆژنامە بەرهەڵستکارەکانی بڕیاردا. لە ئەستەمبوڵ رۆژنامەی ((توحیدی ئەفکار)) و گۆڤاری ((سبیرلیورنات)) و رۆژنامەی

(*) "Vakit", 6-3-1925.



یەکێتییەکان ((سەربەخۆیی)) و سوین تەلگراف)) لە قرابزوف و رۆژنامەی ((پێشکەوتنخواز)) ((سەربەخۆیی)) و لە ئەدەنە رۆژنامەی ((صحبەت)) قەدەغەکران.

لە پاڵ ئەوانەشدا رۆژنامە چەپڕەوەکانی ((ئل یدینگ)) و ((ئەوراق چکیچ)) داخران(*).

هەروەك کۆڕ و کۆمەڵە فەرمانڕەواکان رایانگەیاند حکومەت گەلێك کاروکردەوەی یەك کاڵا کردنەوەی لەدژی رێبازی توندڕەوی گرتەبەر (سەبارەت بە چەپڕەوەکان و راستڕەوەکان).

لە رۆژی **٧**ی ئاداردا رەشبگیری نێوەچلی راگەیاندرا و لە رۆژی دواییدا مستەفا کەمال بانگەوازێکی بۆ دانیشتوان، بۆ سەرباز و فەرمانبەران بڵاوکردەوە و لەوێدا دووپاتیکردەوە کە راپەڕیوەکان لەژێر پەردەی ئایندا خۆیان شاردۆتەوە و ئامانجی دژی شۆڕشیان هەیە.

لە بانگەوازەکەدا وتراوە: لەسەر دانیشتوان و سوپا و دەزگای بەڕێوەبردن و پۆلیس و جەندرمەکان پێویستە ئەرکی سەرشانیان هەستپێبکەن بۆ یارمەتیدانی حکومەت و بەجێگەیاندنی فەرمان و ئامۆژگارییەکانی بۆ لەناوبردنی راپەڕینەکە(*).

(*) M. Toker, Seyh Seit ve Isyani. S. 82.

(*) M. Toker, Seyh Seit ve Isyani. S. 76-77.

ڕۆژنامەی ((وقت)) دەربارەی بانگەوازەکەی مستەفا کەمال نووسیبووی کە ئامانجی سەرەکی ئەم بانگەوازە چەسپاندنی دەسەڵاتی حکومەتە کە وا سەرنج دەدرا لە زۆر ناوچەی ولاتدا لەپێش ڕاپەڕینەکەدا لاواز بوو بوو(*).

لە ١٢ی ئاداری ١٩٢٥ دا دادگای سەربەخۆیی لە ئەنقەرا بانگەوازێکی بۆ هەڕەشەکردن بڵاوکردەوە و ڕایگەیاند کە دادگایەکە بە توندی سزای هەر کەسێك دەدا کە لە دژی ڕژێم ڕای گشتی هانبدات و ڕاپەڕیوەکان هانبدات، یان هەر کەس لە خزمەتی بەیداخ هەڵبێت و کەسانیتر بۆ ڕاکردن لە سوپا قایل بکات، بەمەش یاریدەی ڕاپەڕیوەکان دەدات(*).

پاش چەند ڕۆژێك حزبی کۆماریی گەل پێشنیارەکەی حکومەتی پەسەندکرد. بۆ ئەوەی هەر حوکمێکی لەسێدارەدان کە لەلایەن دادگایەکی ناوچەی ڕاپەڕینەکەوە بدرێت، تەنیا لەلایەن سەرکردەی سوپایی ئەو ناوچەیەوە پەسەند بکرێت(*).

هەر کە ئەم مەسەلەیە خرایە پێش ئەنجوومەنی گەلی تورکیا دەمەقاڵەیەکی توندی خستەوە و بەرهەڵستکاران پێی قایلنەبوون. لەگەڵ ئەوەشدا ئەنجوومەنەکە لە ڕۆژی ٣١ی ئاداردا یاسای ژمارە (٦٩٥)ی دەرکرد و بەو پێیە پێشنیارەکەی حکومەتی پەسەندکرد.

(*) "Vakit" 2. 3. 1995.

(*) ئەمە لە گۆڤاری ((مەسەلەکانی کشتوکاڵ))، ١٩٣١ ژمارەی ١٩/١٠، ل١٠٨ وەرگیراوە.

(*) "Gazet" 31.3.1925.



لە کۆتایی ئاداردا هێزەکانی حکومەت بۆ دەستپێکردنی هێرش بۆ سەر ناوچەکانی ڕاپەڕینەکە لە باکوور و لە باشوور و باشووری ڕۆژهەڵاتدا ئامادەبوون. ژەنەڕاڵ کەمالەدین سامی پاشا سەرکردەیی سوپای تورکیای کرد و ڕایگەیاند کە لە مەسەلەی کورددا سێ ئەرکی سەرەکی لەپێش حکومەتدایە:

١- ڕیشەکێشکردنی خوێنرێژانەی ڕاپەڕیینەکە بەبێ بەزەیی، بەم ئامانجە لە ڕۆژانی یەکەمی نیسانی ١٩٢٥ دا نەخشەی دەستپێکردنی هێرشێکی گشتی کێشرابوو، دەبوو لەشکری ٧ و ٨ و ٩ هەروا لە پێنج تیپەکە یەك تیپ بەشداری تێدابکەن. سەرەڕای سێ فەیلەق.

٢- چەککردنی هەموو کوردەکان، ئەگەرچی لە ڕاپەڕینەکەدا بەشدارییان کردبێ یان نا.

٣- دابەشکردنی کوردەکان بەسەر ناوچەکانی ولاتدا بۆ ئەوەی لە هیچ ناوچەیەکدا زۆربە نەبن و نیشتەجێکردنی تورکەکان لە ناوچە کوردییەکان.

بەگشتی حکومەتی تورکیا لە سیاسەتەکەی خۆیدا بەرامبەر بە کوردەکان ئەو سێ بەندەی دەست پێوەگرت.

ئیمپریالیزمیش بۆ لەناوبردنی ڕاپەڕینی کوردان خزمەتێکی زۆری بە حکومەتی تورکیا پێشکەشکرد. ڕێگەی پێدا لەناو خاکی سوریاوە بۆ سەر کوردانی ڕاپەڕیو تێوەرگەڕێتەوە و لە باشووری ڕۆژهەڵاتەوە تەنگیان پێهەڵبچنێت.

له نیوەی دووەمی مانگی ئاداری ساڵی ١٩٢٥ دا سەرکردایەتی تورکیا بانگەوازێکی ئاڕاستەی دانیشتوانی ئەرزڕۆم، ئازربایجان، دەرسیم، ئال عەزیز، مەلاتیا، ئەوامنا، وان، سیرت، موش، گەنج کرد. لەو بانگەوازەدا هاتووە:

((لەشکری تەمبێ کردن خۆی ئامادەکردووە ... بەتوندی لە هەر کەسێك دەسرەوێنێ کە دژی حکومەتی کۆماری بجولێتەوە. پێویستە دانیشتوان بێگوناهیی خۆیان بسەلمێنن و لایەنگیریی کۆمار ئاشکرا بکەن. بۆ ئەوەی کە لێیان نەدرێ دەبێ دوژمنایەتی راپەڕییوەکان بکەن. دەستبەجێ دەستپێشخەری بکەن و لای کاربەدەستانی مەدەنی و عەسکەریی کۆمارەکە ناونووسکردنی خۆیان لەرێزی سوپادا ئاشکرا بکەن.....))(*).

له سەرەتای مانگی نیساندا سەرکردایەتی سوپا ئاگادارییەکی بڵاوکردەوە. لەوێدا بەڵێنیدا کە هەر کەسێك بە زیندوویی شێخ سەعید بگرێ و تەسلیمی بکات خەڵات دەکرێ کە نزیکەی هەزار لیرەی ئاڵتونە (دەکاتە ٨ هەزار لیرەی کاغەز). ئەگەر بە مردوویی لاشەکەی بدەنە کاربەدەستان ئەوا چەند خەڵات وەردەگرن و لە سزاکانیان خۆش دەبن(*).

بەم چەشنە کاربەدەستانی تورکیا هەموو جۆرە رێوشوێنێکیان بەکارهێنا. هەر لە داپڵۆسینی دڕندانەوە تا دەگاتە ویژدان کڕین، هەمووی بە ئامانجی

(*) "Jurnal dorint" 24.3.1925.

(*) "Jurnal dorint" 24.3.1925.



لەناوبردنی راپەڕینەکە و ئاسانکردنی ئەرکی ریشەکێشانی بزووتنەوەی رزگاری بەخشی کوردەکان.

بەڵام سەرەڕای زاڵبوونی هێزەکانی تورك لە بارەی ژمارە و فیشەکەوە کوردەکان لەسەر بەرگریکردن بەردەوامبوون، لەو هەلومەرجەشدا سەرکردایەتی تورك ئاگادارییەکی تازەی بۆ کوردەکان بڵاوکردەوە و داوای لێکردن کە چەك دابنێن و بە رێگەی بەدەستەوەدانی سەرکردەکانیان گەردنی خۆیان ئازاد بکەن، ئەگەر وانەکەن- واتە کوردەکان- ئەوا دەکەونە بەردەم توندترین سزادانەوە(*).

دادگای سەربەخۆییش لەلای خۆیەوە دەستیکردە هەڕەشە و گوڕەشە. لە ناوەڕاستی نیسانی ١٩٢٥ دا بانگەوازێکی بۆ دانیشتوان بڵاوکردەوە تێیدا رایگەیاند کە بڕیارەکانی ئەم ناوچانە دەگرێتەوە: ویلایەتی ئەرگانی، ئال عەزیز، دیاربەکر، عرفە، هەکاری، دەرسیم، سیفیرك، سیرت، ماردین، ملاتیا، موش، گەنج و تەبلیس و هەروا ناوچەی خنس و کیفی کە سەر بە ویلایەتی ئەرزورۆمن.

هەروا دادگا دەسەڵاتی هەیە کە بەپێی دەستووری کۆمار دەتوانێ توندترین سزا بدات و بچووکترین کردەوە لەدژی ئاسایشی کۆمار و ئاسایشی نەتەوەیی تورکیا بە تاوانێکی گەورە و خیانەت و ناپاکی بەرامبەر نیشتمان دادەنرێ(*).

(*) "ADSAM" 13.4.1925.

(*) Istanbul 14.4.1925.

لە ناوەڕاستی نیساندا لە دۆڵی غینج و بەهۆی ناپاکی و خیانەتی قاسم جبرانەوە گەمارۆی هێزە سەرەکییەکانی ڕاپەڕینەکە درا و لەسەر پردەکەی سەر مورادج شێخ سەعید و سەرکردەکانی تری ڕاپەڕینەکە گیران، لەگەڵ شێخ سەعیدا شێخ عەبدوللا و شێخ عەلی و شێخ غالب و ڕشید ئاغا و محەمەد ئاغا، هەروا بیست و شەش شۆڕشگێڕی تری کورد گیران(*).

لە دوای بەدیلگرتنی سەرکردایەتی چەند دەستەیەکی شۆڕشگێڕان بۆ زنجیرە چیای شرفەدین هەڵهاتن (کە ٤٥کم لە باکووری ڕۆژهەلاتی موشەوە دوورە) لەوێ گەمارۆدران و لەناوبران.

بەکردەوە ڕاپەڕینەکە دامرکێندرایەوە، بەڵام فەرمانڕەوا تورکەکان هەر لەسەر کاروکردەوەی داپلۆسینی یاسایی و بەڕێوەبەری درێژەیان داو بەو پێیە سزای بەشدارانی ڕاپەڕینەکە و کەسانی تریشیان دەدا و هەموو چالاکییەکی بەرهەڵستکارییان قەدەغە کردبوو. بۆ نموونە لە بیستەمی نیسانی ١٩٢٥ دا ئەنجوومەنی گشتی پەرلەمانی تورکیا بڕیاریدا ماوەی حوکمی عورفی لە ناوچەکانی ڕاپەڕینەکە و ویلایەتەکانی دەوروپشتی بۆ ماوەی حەوت مانگی تر درێژبکاتەوە و هەر لەو کاتەدا ڕێگەی دایە حکومەت کە لەو ویلایەتانەدا ئالوگۆڕی ئیداری بکات. ئەنجومەنی گشتی پەرلەمان بۆ ماوەی شەش مانگی تر چالاکی دادگایەکانی سەربەخۆیی لە

(*) S. S. AYDEMIR T. Adam, Mustafa Kamal.



دیاربەکر و ئەنقەرا درێژکردەوە و دەستەڵاتی جێبەجێکردنی حوکمی لەسێدارەدانی پێدان(*).

لە ڕۆژی **٢٢**ی نیسانی **١٩٢٥** دا ئەنجومەنەکە یاسای ژمارە **٦٣٥**ی دەربارەی ئاڵوگۆڕەکانی ناو یاسای تاوانەکان لە وڵاتدا بڕیاردا. بەپێی ئەم ئاڵوگۆڕە هەر کەسێك هەوڵی گۆڕین یان هەڵوەشاندنەوەی دەستوور بدات. یان هەر کەسێك بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەنجوومەن هەوڵبدات و کۆسپ بخاتە ڕێگەی کاروبارەکانی، یان گەل بۆ ڕاپەڕین لەدژی حکومەت ڕاکێشی و خەڵکی تورکیا بۆ یەکتر کوشتن هان بدات حوکمی لە سێدارەدان دەدرێت.

لە ڕۆژی **٣١**ی ئایاردا مستەفا کەمال بانگەوازێکی بۆ دانیشتوان بڵاوکردەوە و تیایدا گوتی حکومەت ئەو سوپایە بڵاوە پێناکا کە بۆ دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکەی کوردان نێردراوە و دادگاکانی سەربەخۆیی لەسەرکاری خۆیان بەردەوام دەبن، هەروا ڕایگەیاند کە هەر کەسێك هەوڵی رووخاندنی کۆمار بدات یان کۆسپ بخاتە بەردەم پێشکەوتنی نیشتمان بە توندی لێیدەدرێ(*).

ڕاپەڕینەکەی شێخ سەعید بەهۆی هەندێك هۆی ناوخۆ و دەرەوە ژێرکەوتنی ئەنجام بوو.

(*) Dustur cilt 6.5.566. 568-569.

(*) B. Cemal Syeh Said Isyani 5.73.75.

هۆی سەرەکی ئەوەبوو کە لە بارەی عەسکەرییەوە حکومەت بە ژمارەو بە فیشەك بەهێزتر بوو. لەسەردەمی راپەڕینەکەدا فەرمانڕەوایانی تورکیا گۆڕینێکی کەمیان لە پێنج فەیلەقی عەسکەریدا کرد و بۆ ئەو مەبەستەش لاوانی پێنج دەورەیان بۆ خزمەتی یەدەگی بانگکرد و هەموو ئەم هێزانە لە رۆژهەڵات و ناوخۆی وڵاتدا کۆکرانەوە. تا ناوچەی راپەڕینەکە گەمارۆ بدەن و بە لێدانێکی جگەر بڕ کۆتایی پێبهێنن. لە ریشەکێشکردنی راپەڕینەکەدا چەند تیپێکی عەسکەری بەشداربوون وەك تیپی پیادەی دووەم و سێیەم و هەشتەم و دوانزەیەم و حەڤدەیەم و تیپی سوارەی یەکەم و چواردەیەم و کەتیبەی سێیەم و چوارەمی جەندرمە پاسەوانەکانی سنوور و فەیلەقی حەوتەمی سوپا و چەند بەشێکی تیپی پیادەی حەوتەم و چل و یەکەم لە ئەدەنە، ملاتیا و بنغدی و چەند بەشێکی فەیلەقی نۆیەم کە لە دیاربەکر بوو. ئەمە سەرەڕای بەشدار بوونی (١٢) فڕۆکە(*) بە پێی قسەی ئیسماعیل حەقی کە لە بزووتنەوەی کورددا بەشداربووە، هەروا ٢٠٠ هەزار سەربازی تورك لەدژی (٤٠) هەزار جەنگاوەری کورد.

هەروا بەپێی دانپیانانی مستەفا کەمال، هەردوو تیپی هەشتەم و نۆیەمی سوپای تورکیا بۆ شەڕ ئامادەکراون(*).

(*) بڕوانە س. ب- ئەفاناسیف- وەزعی کەمە نەتەوایەتییەکانی تورکیا، یەریڤان، ١٩٦٣.

(*) K. Axatura Nutuk. Cilt 2.5.893.



دووەمین هۆی ژێرکەوتنی راپەڕینەکە نەبوونی یەکێتی بوو لە نێوان سەرۆکی خێڵەکاندا و هەندێکیان پشتگیری شێخ سەعیدیان نەکرد. لەکاتی بەرپابوونی راپەڕینەکەدا هەندێك لە سەرۆکی خێڵەکانی موش و سیرت و ناوچەکانی تر بروسکەیان بۆ ئەنجوومەن نارد و لەدژی کردەوەکانی شێخ سسەعید راوەستان و لەو بروسکانەدا پشتگیری و دڵسۆزی خۆیان بۆ حکومەت دووپاتکردەوە(*). هەروا خێڵەکانی دەرسیم پشتیوانی شێخ سەعیدیان نەکرد. دەتوانین ئەم هەڵوێستەی سەرۆك خێڵەکانی دەرسیم واڵێك بدەینەوە کە ئەوان باوەڕیان بە سەرکەوتنی راپەڕینەکە نەبووە و لەوەش ترساون هەڵوێستی نیوە سەربەخۆی خۆیان لەدەستبدەن، سەرەڕای ئەمەش نزیکەی تەواوی خێڵە کوردەکان لە پێناوی مافی نەتەوەییدا بەشداریی خەباتیان کرد، بەڵام یەکگرتوو نەبوون، چونکە بەردەوام ناکۆکییان لەناودا هەبوو. ئەم راستییەش رێگەی نەدان راست بنەوە و بگەنە ئاستی ئەرکە بەرزەکانی نەتەوەیی و هێنانەدی سەرکەوتنی کۆتایی. بەپێی ژمێرەکانی رۆژنامەگەریی تورکیا ئەم راپەڕینەی شێخ سەعید لە گەنجینەی تورکیا پەنجا ملیۆن لیرەی تێچوو(*) ئەم پارەیە چوارییەکی هەموو بوودجەی ساڵانەی وڵات بوو.

(*) "Aksam" 26-2-1925.

(*) Hakimiyeti Milliye 4-5-1925.

سـێیەمین هـۆی ژێرکـەوتنی ڕاپەڕینەکـە نـەبوونی ڕێکـوپێکی سیاسـی یەکگرتووی بەهێزبوو، کە بەرنامەیەکی ئاشکرای بۆ کـارکردن هـەبێ، جـا هەرچـەندە کۆمەڵـەی سـەربەخۆیی کوردسـتان لـەخۆ ئامادەکردنـدا بـۆ ڕاپەڕینەکە دەورێکی گەورەی گێڕا، بەڵام بۆی نەکرا دەورێکی یەکالاکەرەوە لەسەرکردەیی ڕاپەڕینەکەدا بگێڕێت. لەوەش بەولاوە دەستگیرکردنی عەقید خالد جبران بەگ و ڕۆشنبیرانی تری کورد تارادەیەك بزووتنەوەی کوردی لـە ڕابەرانی هۆشمەند و پێگەیشتوو بێبەش کرد, بزووتنەوەی کورد لە ڕاسـتیدا بەبێ ڕێکخەرانی سیاسی مایەوە، ئەمەش بووە هـۆی ئـەوەی ڕاپەڕینەکـە لەپێش وادەی خۆیـدا بـەرپابکرێت، بـەپێی هەلومەرجەکـە شـێخ سـەعید سەرکردایەتی کرد. بەتەنیا نیشتمانپەروەرێتی شـێخ سـەعید و کـارکردنی گەورەی لەسەر دانیشتوان، هەروا پاڵەوانێتی ڕاپەڕیوەکان بەس نـەبوون بـۆ سەرکەوتنی ڕاپەڕینەکە و هەروا نەبوونی پشتگیری دەرەوە بـۆ ڕاپەڕینەکـە هۆیەکی گرنگ بوو، کە لە هۆیەکانی تر کەمتر نـەبوو. لـە ئـەنجامی ئـەم هۆیانە و هەندێك هـۆی تـردا ڕاپەڕینەکـەی کـوردان لەلایـەن فـەرمانڕەوا تورکەکانەوە ڕیشەکێشکرا.



## گیرانی ڕابەرانی کورد و مەحکەمەکردنیان

کەمالییەکان دەیانزانی کە چەند ڕێکخراوی نهێنـی کـوردی هەیـە. لەبـەر ئـەوەبوو هەنـدێك کاورباریـان بـۆ بێبەشـکردنی ئـەم ڕێکخراوانـە لـە سەرکردەکانیان جێبەجێکرد. بۆ نموونە ئەوەبوو نۆکەرێکی پۆلیـسی نهێنـی تورکییان ناردە لای سەید عەبدولقادری سەرکردەی کۆمەڵەی بووژاندنەوەی کوردستان، ئەم نۆکـەرە وا خـۆی بـە سـەید عەبـدولقادر ناسـاند کـە لـە وەزارەتی دەرەوەی ئینگلیز فەرمانبەرە و ئامادەیـە (٨٠) هەشـتا ملیـۆن لیرەی پێبدات. بـەڵام سـەید عەبـدولقادر قایلنـەبوو چـەکی ئـەو پارەییـە وەربگرێت، هەروا قایلنەبوو ڕێکەوتنێك مۆربکات کە میتی تورکیا ڕێکـی خستبوو. ئەم نۆکەرە خستییە پێش چاوی بۆ ڕێکخستنی ڕاپەڕینێك، بەڵام سەرەڕای ئەوەش چارەنووسـی ڕابـەرە کوردەکـان لـە ئەسـتەمبوڵ لەلایـەن کەمالییەکانەوە بڕیـاردرا لـە ڕۆژی ١٣ی ئـاداری ١٩٢٥ دا بـە فـەرمانی وەزیـری نـاوخۆ سـەید عەبـدولقادر و سـەید محەمـەدی کـوڕی (خـەڵکی سـلێمانییە) و کـوڕی عەبـدوڵڵا سـعادی، هـەروەها سـەرۆکی خێڵـەکانی هۆشنبان کە لای سەید عەبدولقادر لە سعادیە (ئەستەمبوڵ) بوون، گیران.

لە پاڵ ئەوەشدا سەرۆکی پۆلیسی ئەستەمبوڵ هەندێ کاروباری بەڕێوەبەرێتی بەجێگەیاند بە مەبەستی سنووردانان بۆ هەڵسوڕانی کوردەکان لە ئەستەمبوڵ ژمارەی کوردەکان لەوێ نزیکەی دە هەزار کەس دەبوون کە زۆربەیان حەماڵ بوون(*).

لە ١٤ی ئایاردا لە دیاربەکر مەحکەمەکردنی سەید عەبدولقادر و پیاوانی ناسراو کە گیرابوون، بە تاوانی هەوڵدان بۆ پێکهێنانی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردستان دەستپێکرد. سری بەگ کە داواکاری گشتی دادگای سەربەخۆیی بوو لای ڕۆژنامە نووسەکان گوتی: ((سەناتۆری پێشوو سەید عەبدولقادر و لایەنگیرەکانی تا ناوەڕاستی نیسان بە چالاکی بۆ سەرکەوتنی ڕاپەڕینەکە و سەربەخۆیی کوردستان هەوڵیانداوە. ئەوانەش کە بە چالاکی کاریان لەگەڵ کردووە سەید محەمەدی کوڕی (خەڵکی سلێمانییە) و بەتایبەتی کور عەبدوڵڵا سعادی))(*).

لە دادگادا سەید عەبدولقادر نکۆڵی لە بەشداری کردنی ڕاپەڕینەکەی شێخ سەعید کرد، تەنانەت لە دادگادا گوتی: ((ئەگەر ئاگاداری بەرپابوونی ئەم ڕاپەڕینە بوومایە دەستبەجێ کاربەدەستانم ئاگادار دەکرد))، لە ڕاستیشدا سەید عبدولقادر بەشداری ڕاپەڕینەکەی نەکردبوو، بەڵام بێگومان ئاگاداری

(*) ISTANBUL. 26-8-1925.

(*) ISTANBUL. 7-5-1925.



خۆئامادەکردن بوو بۆ ڕاپەڕینەکە بەتایبەتی پاش یەکتر دیتنی لەگەڵ عەلی ڕەزا (کە کوڕی شێخ سەعیدە) لە ئەستەمبوڵ.

هەر لەو کاتەشدا کورسعادی لە دادگادا زۆر ناشیرین جوڵایەوە و لە ڕاستیدا بۆ گرتنی پیاوە کوردە ناسراوەکان یارمەتیدا و هەر بەخۆشی خۆی باسی بزووتنەوەی ڕابەرانی کوردی کرد و گوتی: بەڵێ ئەمانە چەندان ساڵە هەوڵدەدەن کوردستانی سەربەخۆ دابمەزرێنن، بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە خۆیەوە هەبێ ئەوەیە پێش جەنگی یەکەمی جیهان دەستیبەکارکردووە و بۆ ئەوەش بوو بۆلای نایف نێردرا و لە دامەزراندنی کۆمەڵەی جۆربەجۆری کورددا بەشداریکرد و لەماوەی شەڕی ڕزگاریخوازیدا لە دژی هێزە نیشتمانپەروەرەکان هەستا، لەمەش زیاتر هەر بەویستی خۆی ڕایگەیاند کە سەید عەبدولقادر سەرکردەی هەموو هەڵسوڕانێکی کوردان بووە و گوتی: ((تەنانەت بەبێ ئاگاداربوونی سەید عەبدولقادر پارچە کاغەزێك لە کوردستان نالەرێتەوە))(*).

لە ناوەڕاستی ئایاری ١٩٢٥ دا دادگای سەربەخۆیی دیاربەکر تەماشای مەسەلەی کەمال فەوزی بەدلیسی کرد. ناوبراو بۆ دادگای ئاشکراکرد کە لە کاتی شۆڕشدا لە ئەستەمبوڵ بووە و هەروا ڕایگەیاند کە لە یەك کاتدا ئەندامی دوو کۆمەڵەی کوردی بووە. کۆمەڵەی بووژاندنەوەی کوردستان و ((کۆمەڵەی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات)) کە لەڕاستیدا ((کۆمەڵەی

(*) M. TOKAR, Seyh Sait ve Isyani, 5. 117.

سەربەخۆیی کوردستان)) بوو، پاشان بۆ ماوەی دوو مانگ سکرتێری ئەو کۆمەڵەیە بوو، پاشان دەستی لەو پایەیە بەردا بۆ ئەوەی رۆژنامەی کوردی (ژین) دەربکات. هەروا کەمال فەوزی چاپەمەنی جۆربەجۆری کوردی بڵاوکردەوە و بەناو خەڵکیدا دابەشی دەکرد. ئەمەشی بەهۆی سەرۆك خێلەکانی شیرنال و ویلایەتی سیرتەوە دەکرد(*).

پاش کۆتایی هاتنی کاروباری دادگا سەید عەبدولقادر و سەید محەمەدی کوڕی و حاجی ئاختی پارێزەر و کورسعادی و رۆژنامەنووس و پیاوی ناسراوی کۆمەڵایەتی کورد کەمال فەوزی و خواجە عەسکەری حوکمی لە سێدارەدانیان تا مردن درا بەسەرا(*).

پاش چوار رۆژ واتە لە ۲۷ی ئایاری ۱۹۲۵ دا لە دیاربەکر فەرمانی خنکاندنی کەمال فەوزی و حاجی ئاختی و سەید عەبدولقادر و کورعبدوڵلا سعادی و خواجە عەسکەری جێبەجێکرا و لەپێش لەسێدارەدانیدا حاجی ئاختی هاواری کرد: ((بژی خەبات لەپێناوی کوردستاندا، بژی کوردستان))(*)، بەڵام سەید عەبدولقادر هیواداریی پێشاندا کە لەسێدارەدانی ببێتە هۆی بەهێزکردنی کۆششی کوردان لەپێناوی رزگاربوونی نەتەوەییدا.

(*) ((Aksam)) 12-5-1925.

(*)M. TOKAR, Seyh Sait ve Isyani, 5. 118.

(*) JORNAL, Seyh Sait ve Isyani 5-118.



لەکاتی لێکۆڵینەوەدا دەرکەوت کە لە دیاربەکر لەپێش و لەکاتی راپەڕینەکەدا رێکخراوێکی نهێنی کوردی هەبووە، ئەم رێکخراوەیە یاریدەی راپەڕیوەکانی داوە و نیازی وابووە شارەکەیان بەدەستەوە بدات، بەڵام رابەرەکانی پێشەکی لەلایەن کاربەدەستانەوە گیراون. هەر ئەمەش تاڕادەیەکی گەورە ژێر کەوتنی راپەڕینەکە لە دیاربەکر لێکدەداتەوە. بەتایبەتی لەو کاتەدا کە شێخ سەعید دەوری شاری گرتبوو. دکتۆر فوئاد ئەندامێکی بەکاری ئەم رێکخراوەیە بوو.

لەکاتیێ لێکۆڵینەوەدا لەگەڵ فوئاد بەگ لە دیاربەکر نامەکانی کە بۆ فەرید پاشای وەزیری پێشووی جەنگ لە حکومەتەکەی سوڵتاندا ناردبوو خوێندرایەوە. لەم نامانەدا راست و رەوان سۆز و خۆشەویستی بزووتنەوەی کوردی باسکردبوو(*).

لە نیسانی ۱۹۲۵ دا، دکتۆر فوئاد بەگ لەبەر چالاکی بۆ پێکەوەنانی کوردستانێکی سەربەخۆ لەلایەن دادگای سەربەخۆییەوە حوکمی لەسێدارەدانی بەسەردرا. مەزهەر موفتی بەگی سەرۆکی دادگا ئەم حوکمەی راگەیاند و رووی‌کردە دکتۆر فوئاد بەگ و گوتی: بەهۆی تاوانەکەتەوە کە بۆتە هۆی راپەڕینێکی خوێناوی سزای مردنت بەسەردا

(*) بڕوانە م- حەسرەتیان: سیاسەتی فەرمانڕەوایانی تورك.

دەدرێ و دەبێ پیاوانە رووبەڕووی ئەم حوکمە ببیتەوە. دکتۆر فوئاد بە توندی وەڵامی دایەوە و گوتی: من ئەو پیاوەتییەم تێدایە(*).

لەبەردەمی پەتی سێدارەدا دکتۆر فوئاد هاواریکرد: ((من هەمیشە خەونی ئەوەم دەدی کە لەپێناوی نیشتمانەکەمدا گیانم بەختبکەم و ئێستاش هیچ گومانم لەوە نییە کە ئاڵای سەربەخۆیی لەسەر ئەم خاکەی ئێستا ئێمەی لەسەر لەسێدارە دەدرێین بەرزدەکرێتەوە)).

لە کۆتایی ئایاری ١٩٢٥ دا دادگاییکردنی شێخ سەعید و رابەرانی تری راپەڕینەکە دەستیپێکرد و مانگێکی تەواوی خایاند.

لە قەفەزی تاوانباریدا شان بە شانی شێخ سەعید ئەمانەش راوەستابوون: شێخ عەبدوڵڵا (خەڵکی میلیکان) و چەند کەسێك بەناوی رەشید و رائیدی تەقاویتکراو ئیسماعیل و مەلا ئیمام و شێخ عەلی و شێخ ئیسماعیلی خەڵکی جزیرە و شێخ عەبدوللەتیفی خەڵکی جەزیرە و کامل و بابا بیك رەشید تیمور و محەمەد و سلێمان و رائیدی تەقاویتکراو بەحری ئەمین و شەوکەت و مەقسود و حەمید و عەبدولمەجید کە داواکاری گشتی بوو لە مەلازگرد، شێخ شەریف و سلێمان (خەڵکی چەبەق چوور) عەلی و یوسف حسێن و مەلا جەمال کە مامۆستای سەرەتایی بوو، نیعمەت و ئەحمەد و

(*) بڕوانە: م. ا. حەسرەتیان، سیاسەتی فەرمانڕەوا تورکەکان لە راستی دانیشتووە کوردەکاندا (١٩٢٤-١٩٣٩) ((هەندێ کورتە زانیاری))، ١٩٦١، ژمارە ٣٠، ل١٢٥.



محەمەد موکری کە لە جەندرمەدا ملازم بوو، نیازی کە لە گەنج فەرمانبەری تەندروستی بوو، حاجی سادق و کەسانی تریش(*).

لە ٢٩ی ئایاری ١٩٢٥ دا دادگای سەربەخۆیی لە دیاربەکر ٤٧ کەسی لە بەشدارانی راپەڕینەکە لە سەرووی هەموویانەوە شێخ سەعیدی بە خنکاندن تا مردن حوکم داو بۆ رۆژی دوایی حوکمەکەیان جێبەجێ کرد.

لەبەردەمی پەتی سێدارەدا شێخ سەعید گوتی: ((من گەیشتمە کۆتایی ژیانی ئاسایی خۆم و پەشیمانیش نیم لەوەی کەوا ژیانی خۆم لەپێناوی نیشتمانەکەم و لەپێناوی گەلەکەمدا دەکەمە قوربانی و ئەوەندەمان بەسە نەوەکانمان لەبەردەمی دوژمندا شەرمەزار نابن)).

بە خنکاندنی شێخ سەعید و رابەرانی تر کوشت و بڕ و داپلۆسین بەرامبەر بەشدارانی راپەڕینەکە کۆتایی نەهات، کاربەدەستانی تورکیا تا ماوەیەکی دوورودرێژ گومانیان لە هەر کەس بکردایە راویان دەنا و دەیانگرت تا بیدەنە دادگای سەربەخۆیی تا حوکمی سەختی بەسەردا بدەن.

کاربەدەستە فەرمانڕەواکانی تورك راپەڕینەکەیان کردە مۆڵەت، نەك تەنیا بۆ کوشت و بڕینی بەشدارانی، بەڵکو تەنانەت بەرامبەر هەموو کوردە خاوەن دەسەڵاتەکان و لایەنگرەکانی کەمالییەکانیش. بۆ نموونە: حەسەن خەیری کە لە ئەنجوومەنی گەلی تورکیدا نوێنەری رۆشنبیرەکان بوو

(*) سەرچاوەی پێشوو.

نامەیەکی لەکاتی ڕاپەڕینەکەدا بۆ دەرسیمییەکان نارد و بۆ بێدەنگی و ئارامی هانیدابوون(*)، لەگەڵ ئەمەشدا دوای ڕیشەکێشانی ڕاپەڕینەکە لەلایەن کاربەدەستانەوە بە فەرمانی مستەفا کەمال خۆی لەگەڵ جەلال محەمەدی برازایدا گرتیان. لەکاتی لێکۆڵینەوەدا عەلی سائیب کە سەرۆکی دادگای سەربەخۆیی بوو ڕووی کردە حەسەن خەیری و گوتی: تۆ لە ئەنقەرە بە جلوبەرگی کوردییەوە دەهاتییە ئەنجوومەن. بەم کارەش پڕوپاگەندەی کوردایەتیت دەکرد.

حەسەن خەیری لەکاتی مەحکەمە کردنەکەیدا لە دادگادا گوتی لەسەر داخوازی مستەفا کەمال بووە کە بە جلوبەرگی کوردییەوە هاتۆتە ئەنجومەن. بروسکەشی بۆ کۆنگرەی لۆزان ناردووە و ڕایگەیاندووە کە کوردەکان حەز ناکەن لە تورکەکان جیاببنەوە، بەڵام ئەم قسانەی ناو دادگا کاری نەکردە سەر ئەندامانی دادگایەکە و دەستی پێ نەگیرانەوە، بەڵکو بڕیاری خۆیاندا کە حەسەن خەیری و جەلال محەمەدی برازای لەسێدارە بدرێن.

دەشێ حەسەن خەیری لەپێش خنکاندنیدا هەستی کردبێ کە سیاسەتی کەمالییەکان پێچەوانەی کوردانە. لەبەر ئەوە بوو ڕێزی تەواوی نا لەو کوردانەی خۆیان کردە قوربانی لە پێناوی گەلەکەیاندا و لەبەردەمی پەتی

(*) I. Gid, 5. 188, 190.



سێدارەدا هاواریکرد: ((بژی گەلی کورد، ئەی قوربانییەکانی کوردستان ئێستا وا ئیتر حەسەن خەیری دێتە پاڵتان)).

لە ٢٦ی ئەیلوولی ١٩٢٥ دا دادگای سەربەخۆیی لە دیاربەکر حوکمی لەسێدارەدانی دا بەسەر بوغوس-ی ئاسنگەری کوڕی هاکار کە لە جیمسکیزس لەدایك ببوو، بەهۆی بەشداریکردنی کاریگەرەوە لە ڕاپەڕینی کوردان‌دا و بە تاوانی جاسوسی کردن بۆ بەرژەوەندیی شۆڕشگێڕان لە هاربوت))(*).

بەپێی نووسینی ڕۆژنامەکانی تورکیا لە کۆتایی ئەیلوولی ساڵی ١٩٢٥ دا دادگای پارێزگەکانی ڕۆژهەڵات ٣٧٩ مەسەلەیان دەرهەق بە ١٨٥٥ کەس تەماشا کردووە.

هەر لەو کاتەدا ئەو دادگایە تەماشای ١٣٨ مەسەلەی کردووە سەبارەت بە ٦٩٠ کەس کە ١٢٠ کەسیان حوکمی لەسێدارەدان دراون. لەمانە ٢١ کەسیان ئامادە نەبوون، ١١٦ کەسیشیان بۆ ماوەی جۆربەجۆر بەندکراون و ١٠٤ کەسیشیان دراونە دادگای تر و ئەوانی تریش بێ گوناه دەرچوون(*).

(*) ISTANBUL. 28. 9. 1925.

(*) GAZET. 25. 9. 1925.

بەڵام بەپێی زانیارییەکانی م. ن. دەرسیمی دادگای سەربەخۆیی تەنیا لە هاربوت حوکمی لەسێدارەدانی بەسەر ٤٠٠ کەسی کورددا داوە لە بالو و چەبەق چوور(*).

لێکۆڵینەوەی باری پێکهاتنی کۆمەلایەتی ئەو کەسانەی راکێشی دادگا کران، یان حوکمی مردنیان بەسەرا درا، ئەوە دەردەخات کە ئەوانەی لە ئامادەکردنی راپەڕینەکەدا بەشداریان کردووە ئەو ئەفسەرە کوردانە بوون کەلای تورکەکان خزمەتیان دەکرد. هەروا شێخەکان و خاوەن مولکەکانی زەوی و زار و نوێنەرانی پێشووی پەرلەمانی سوڵتان، هەروا ئەنجومەن و بازرگان و رۆژنامەنووس و مامۆستا و دکتۆری بەیتاڵ و کەسانی تری رۆشنبیری کوردبوون، هەر لەو کاتەشدا بەشداریکردنی توێژە کۆمەلایەتییە جۆربەجۆرەکانی کورد لە راپەڕینەکەدا ئەوە دەسەلمێنێ کە تەنیا خەبات لە پێناوی رزگاربوون لە تەوق و کۆتی تورکەکان هەموویانی یەك خستووە.

شتێکی بەکەڵکە ئەوەش باسبکەین کە ئاشوورییەکان و چەرکەسەکانیش بە ژمارەیەکی کەم شان بەشانی کوردان بەشداری راپەڕینەکەیان کردبوو، بەلام بەشداریی ئەم کەمایەتییانە لە راپەڕینەکەدا (بەو کەمایەتیەشەوە کە موسڵمان نییە) مانایەکی تایبەتی هەیە و ئەوە دەگەیەنێ کە ئەم کەمایەتییانە لە سیاسەتی تاواندنەوە و شۆڤێنیزمی فەرمانڕەوا تورکە کۆنەپەرستەکان زۆر بێزاربوون.

(*) M. N. Dersimi, Kurdistan Tarihinde. Dersim 5-181.



سەبارەت بە بەشداریی کەمە نەتەوایەتییەکان لە راپەڕینی کورداندا رۆژنامەکانی تورکیاش هەندێ شتیان نووسی بوو. رۆژنامەی ((حاکمیتی میللی)) نووسویەتی دەڵێ: ((نەك تەنیا ئاشوورییەکان، بەڵکو هەروەها ئەرمەنییەکانیش چووبوونە پاڵ کوردە راپەڕیوەکان، بەئامانجی پێکەوەنانی ئەرمینیایەکی سەربەخۆی یەکگرتوو لەگەڵ کوردستان(*))).

سەرکردایەتی فەیلەقی عەسکەری تورك، لە هەوڵدانێکیدا بۆ خۆشکردنی ئاگری فیتنەی تایەفەگەری لە نێوان تورك و کورد و ئەرمەن و ئاشوورییەکاندا، بلاوکراوێکی بەناوچەکەدا پەخشکرد کە دەڵێ: ((شێخ سەعید کە لەناوچەی غنجدا سەرکردایەتی راپەڕینەکەی کرد. هەروەها لە بزووتنەوەی ئاشوورییەکانیشدا بەشداربوو، لەلایەن دادگای سوپاییەوە لە بەدلیس بەهۆی ناپاکییەوە بەرامبەر نیشتمان تاوانبارکرا، لای بەدیل گیراوە ئاشووری و ئەرمەنییەکان هەندێك بەڵگەنامە دۆزراونەتەوە کە هاریکاری شێخ سەعید لەگەڵ ئەرمەن و ئاشوورییەکان دەسەلمێنن، بە ئامانجی پێکەوەنانی کوردستانێکی سەربەخۆ. حەزکردن لە تۆڵەسەندنەوە لەدژی ئێمە، وای لە ئەرمەنییەکان کردووە کە هەموو هەڵێك بکەنە مۆڵەت بۆ لەناوبردنی هەر رەگەزێك کە ئەرمەنی نەبێ. بەتایبەتی کوردەکان کە یاریدەیان پێشکەش دەکرێ، ئەوان دەیانەوێ لەسەر خاکی ئێمە و لەسەر دار و پەردووی رەگەزی موسوڵمان ئەرمینیایەکی نوێ

(*) Hakimiyeti Millye 2. 3. 1925.

دروستبکەن. ریشەکێشکردنی ئەو یاخیبووانە لە هەموو شوێنێك بەسەرکەوتوویی جێبەجێ دەکرێ))، سەرۆکی فەیلەقەکە زۆرتر پێی هەڵدەبڕی و داوا دەکا ((سوود لە هەموو هەلێك وەربگیرێت بۆ تێگەیاندنی ئەم راستییە لە دانیشتوان))(*).

لەکاتی سەرکوتکردنی راپەڕینەکەدا کەمالییەکان ویستیان ناکۆکی نەتەوەیی و تایەفەگەری بخەنەوە، ئەمەش بە رێگەی هاندانی موسڵمانەکان بەرامبەر کەمایەتی فەلەکان لە وڵاتدا، بەڵام رابەرانی راپەڕینەکە هەڵوێستێکی جیاوازیان گرتەبەر و کاتێك شێخ سەعیدیان ئاگادارکرد کە هەندێك لایەنگیری ئەو عەزیەتی ئەرمەنەکان دەدەن، بەئاشکرا رایگەیاند: ((هەر کەسێك دەرهەق بە ئەرمەنییەکان خراپە بکات سەختترین سزای دەدرێ)) و رۆژنامەکانی ئەرمەنی رایانگەیاند کە دوای ئەوە هیچ کەس لە ئەرمەنییەکان تووشی خراپە نەبووە و هەروا رێکخراوە ئەرمەنییەکان و کوردەکان لە دەرەوەی وڵاتیش لە دژی سیاسەتی چەوسانەوەی نەتەوەیی لە تورکیادا دەستیان بە لێك نزیکبوونەوە کردووە.

دوای دامرکاندنەوەی شۆڕش و لەناوبردنی سەرکردەکانی، کوشت و بڕ دژی دانیشتوانی کورد و ئەرمەنی دەستپێکرد و سوپای تورکیا کەوتە تاڵان و سوتاندنی دێهات و پیرەمێرد و ئافرەت و منداڵ کوشتن.

(*) Gazet 5. 3. 1925.



ئارمستڕۆنگ باری کوشت و بڕو داپلۆسینی کوردانی ئاشکرا کردبوو کە نووسیبووی: ((کوردستان کەوتۆتە بەرتینی شمشێر و ئاگر، پیاوانیان کوشت و لەسێدارەدران و دێهاتیان تالانکرد و سوتاند، ئافرەت و منداڵیان کوشت، پیلانیان بۆ کوردان رێکخست و سەربڕینیان بۆ سازکردن. دڕندایەتی خوێن رشتن زۆر لەوە تێپەڕی کرد کە سوڵتان دەرهەق بە یۆنانی و ئەرمەن و بۆلگارەکان کردی .. بەپێی بڕیاری دادگایەکان چۆن بگونجایە و بکرایە کوردەکان لەسێدارەدەدران و دوور دەخرانەوە و بەند دەکران(*).

هەروا لەو نامانەدا کە کۆمەڵەی ئاشوورییەکان لە ئابی ١٩٢٥ دا بۆ کۆمەڵی نەتەوەکانیان ناردبوو دڕندەیی سوپای تورك و کوشت و بڕیان دەرهەق بە دانیشتوان باس کرابوون(*).

دوای دامرکاندنەوەی راپەڕینەکە، لە ساڵانی ١٩٢٥-١٩٢٦ دا سەدان گوند وێرانکران و هەزاران ماڵ سوتێنران و بە هەزاران دانیشتوانی بێ وەی لە ئافرەت و منداڵ و بەساڵاچوو کوژران و ئاوارەکران.

سەرەڕای هەموو ئەمانەش هێشتا باری گوزەرانی گەلی کورد نەکەوتە بەرچاوی رێکخراوە جیهانییەکانی کۆمەڵەی نەتەوەکان، ئەمەش بانگەوازێکە لەو بانگەوازانەی کە لەلایەن پیاوانی ناوداری کوردەوە بۆ کۆمەڵەی نەتەوەکان نێردراوە. ئەم بانگەوازانە لەلایەن نیشتمانپەروەری

(*) H. C. ARMSTRONG Grey Welf, Mustafa Kamal P. 26.

(*) Asia Francase Paris 1926, 238. P.86.

ناسراوی کورد (ئەحمەد عەلی حاجی سەبری)یەوە لە رۆژی ٢٥ی تەمووزی ١٩٢٥ دا بەکۆمەڵەی نەتەوەکانی پێشکەشکردووە.

((... ئەوا دوو مانگ تێپەڕبوو کە خوێن وەك سیلاو لە وڵاتەکەماندا دەڕژێت و گەلی کورد لەژێر باری زۆرداری بەربەرییەکاندا دەناڵێنی پاش ئەوەی کە نەیتوانی لەوە زیاتر شان بداتە بەر زوڵم و زۆرداری و چەوسانەوە ناچاربوو پەنا بەرێتە بەر چەك تا بە ئازادی چارەنووسی خۆی بگرێتە دەست، ئەو خەباتەی دەستمان داوەتێ مانەوەمان لە دوا رۆژدا زامندەکات و هەر لەسەر خەبات درێژە دەدەین تا بەتەواوی گەلەکەمان لەژێر دەستەی حکومەتی ئەنقەرا رزگاری دەبێ، گەلی کورد خۆی گەلێکی ئارییە و لەڕووی سەرچاوەی پەیدابوون و خوونەریت و زمانەوە هیچ پەیوەندی لەگەڵ تورکەکاندا نییە. گوێپێنەدانی حکوومەتەکانی رۆژئاوا هانەی حکوومەتی ئەنقەرا دەدات کە سیاسەتی لەناوبردن و قەڵاچۆکردن دژی گەلی کوردمان پەیڕەو بکەن. ئەو سیاسەتەی کە سەرکەوتووانە دەرهەق بە ئەرمەن پەیڕەویان کرد. بزووتنەوەکەمان سروشتێکی ئاشکرای نەتەوەیی هەیە، گەلی کوردمان لە کۆمەڵەی نەتەوەکان و گەلانی پێشکەوتوو داوا دەکات یارمەتی بە کار و خێراو بەپەلەی بدەن. دەست تێوەردانی دەوڵەتانی رۆژئاوا نەك تەنیا ئەرکێکی مرۆڤ دۆستانەیە و بەس بەڵکو هەروەها



پێداویستێکی سیاسیشە چونکە بەلای گەلی کوردەوە زامنی ئاشتییە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا))[*].

بەڵام کۆمەڵەی نەتەوەکان وەڵامی هیچ یەکێك لەم بانگەوازانەی نەدایەوە کە ئاڕاستەی کران، لەمەش زیاتر کۆمەڵی نەتەوەکان لە تەمووزی ١٩٢٥ دا بڕیارێکی دەرکرد تەماشای پڕۆتیستی کوردەکان نەکات و لەدژی ئەو کاروکردەوانەی حکومەتی تورکیا نەوەستێ کە رووبەڕووی کوردە راپەڕیوەکانی کوردستانی تورکیا دەیکات.

دامرکاندنەوەی دڕندانەی راپەڕینەکەی ساڵی ١٩٢٥ و لەسێدارەدانی زۆر لە رابەرانی بووە مایەی بێزاری و پرۆتیستێکی زۆری خەڵکی کوردستانی خواروو.

بۆ نموونە لە رۆژی ٢٦ی تەمووزی ١٩٢٥ دا کوردەکان کۆبوونەوەیەکی جەماوەرییان لە باخچەی (مود) لە بەغدا سازکرد بۆ دەربڕینی بێزاری بەرامبەر دڕندەیی کاربەدەستانی تورکیا بەرامبەر کوردەکان.

بەشدارانی ئەو کۆبوونەوەیە بروسکەیان بۆ کۆمەڵەی نەتەوەکان و حکومەتی دەوڵەتە گەورەکان نارد و داوایان لێکردن کە یارمەتی کوردانی

(*) GAZET 29. 6. 1925.

تورکیا بدەن(*). هەروا کوردانی سلێمانی و کەرکوك و هەولێر و شارەکانی تری کوردستانی عێراق بێزارییان دەربڕی، بەڵام کوردانی عێراق و ئێران نەیانتوانی یارمەتییەکی کاریگەر بە کوردانی تورکیا پێشکەش بکەن.

راپەڕینەکەی شێخ سەعید کارێکی زۆر قووڵی کردە سەر مێژووی گەلی کورد، ئەمەش بەڕوونی لە ئەدەبی کورددا دەردەکەوێ، بەتایبەتی لە داستانە بەناوبانگەکەی شاعیری ناوداری کورد پیرەمێرددا. لەم داستانەدا شاعیرەکە حکومەتی تورکیای شوبهاندووە بە ((مەکینەیەك کە ئەگەر بە خوێنی گەلی کورد چەورنەکرێ لە کوردستاندا توانای کارکردنی نابێ)).

(*) رۆژنامەی (ژین): ژمارەی رۆژی ١٩٦١/٥/٢٢، لە کتێبەکەی دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد (بزووتنەوەی رزگاریخوازی نیشتمانی کورد لە کوردستانی تورکیا) وەرگیراوە.



## سروشتی راپەڕینەکە

راپەڕینەکەی شێخ سەعید چ لەبارەی فراوانی، یان لەڕووی رێکوپێکییەوە لە مێژووی گەلی کورددا نموونەی نەبووە. لێکدانەوەی هۆیەکانی ئەم راپەڕینە، لە رۆژنامەکانی تورکیا و رۆژنامەکانی رۆژئاوادا ناکۆکی و دەمەقاڵە و گفتوگۆیەکی زۆری بەرپاکردبوو. ئەم بیروڕایانە لەسەر بنچەیەکی زانستی دانەڕێژرابوون، بەڵکو هەوەسی سیاسییە سەرگەرمەکانیان پێشاندەدا کە لەبارەی راپەڕینەکەی کوردانەوە نووسیبوویان و لەپێش هەموو شتێکەوە لە گۆشەی بەرژەوەندییەکانی وڵات و چین و توێژە کۆمەڵایەتییەکانیانەوە تێهەڵدەچوون.

رۆژنامەگەریی تورکیاش لەو قۆناغەدا، دەربارەی هۆیەکان و سروشتی راپەڕینەکە بیروڕایان جیاواز و ناکۆك بوو. هەندێك لەو باوەڕەدابوون کە راپەڕینەکە چەتەگەرییەکی چەند خێلی دڕندەیە. رۆژنامەی (تانین) لەم بارەیەوە دەنووسێ: ((راپەڕینەکان خاوەنی بیروڕا و بڕوان، بەڵام ئاخۆ ئەم قەومە وەحشییە کۆچەرانە خاوەنی چ بیروباوەڕ و مەبدەئێکن ... ئەگەر بیروباوەڕ توانای گەیشتنە مێشکی ئەمانەی هەبوایە. هەڵبەت ئەم چەشنە کردەوانەیان نەدەکرد ... لە ئەقڵی ساویلکە و سادە و پووچی ئەمانەدا کە

نەزانین و مێشك پووتی و سوفیگەریی لە بیروباوەڕ و ژیری بێبەش کردوون، لەبەر ئەوە لای ئەمانە تەنیا یەك باوەڕ فەرمانڕەوایە ئەویش تالآن و چەتەگەرییە))(*).

بەپێی بیروڕای دووەم هۆی سەرەکی بەرپابوونی راپەڕینەکە دەمارتوندی ئایینی کوردەکان بوو. ئینسکلۆپیدیای تورکی (واتە موسوعە یان دائرە المعارف-وەرگێڕ) دەنووسێ: ((هەندێك لە سیاسییە خاینەکانی، نۆکەرانی بێگانە ... لەلایەکەوە ئاگری دەمارتوندییان هەڵگیرساند، لەلایەکی تریشەوە بەڵێنیان دابووە چیاییەکان کە خەڵکی شارەکان تالآن بکەن- ئەمانە بوونە هۆی بەرپابوونی راپەڕینەکە))(*).

لایەنگرانی ئەم بیروڕایە دووپاتیان دەکردەوە کە جوتیارەکان دواکەتوون و شێخەکان رابەرێتییان دەکەن، لەناوی خەلیفایەتی و سوڵتانییەوە لەدژی حوکمی جمهوری خەباتدەکەن ... بۆ دەرخستنی راستی ئەم بیروڕایەشیان هەندێ بروبیانوویان دەهێنایەوە کە شێخ و لایەنگرەکانی سەرۆکایەتی راپەڕینەکە دەکەن، لەوەش زیاتر ئەوەیان کردبوو بە قاو کە گوایە نوێنەری میراتگرانی سوڵتانی لێخراوی تورك لە راپەڕینەکەدا بەشدارە. ئەم بیروڕایە تەنانەت شایانی رەخنە لێگرتنیش نییە. پێش هەموو شتێك وەکو لەمەوبەر باسمانکرد، ئەوانەی کاریان بۆ راپەڕینەکە سازکرد شێخەکان

---

(*) ((Tanin)) 28. 2. 1925.

(*) Hayat Ansi "Lopedisi" Cilt 20, Istanbul, S. 4359.



نەبوون بەڵکو ((کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردستان)) بوو بە سەرۆکایەتی پیاوانی ناسراو و رۆشنبیری کوردی وەك خالد جبری بەگ کە لە سوپای تورکیدا عەقیدبوو. کەمال فەوزی رۆژنامەنووس و دوکتۆر فوئاد و کەسانی تر، جگە لەوەش دروشمی خەبات بە ناوی ((پەیڕەوکردنی شەریعەتەوە)) دەورێکی دووەمینی هەبوو لەچاو دروشمی سەرەکی راپەڕینەکەدا: ((سەربەخۆیی کوردستان)). جا ئیتر بۆچی دەبێ کوردان بۆ قازانجی خەلیفەکان رابەری بن و لەوەش زیاتر بۆ شەخسی کوڕەکەی سوڵتانی پێشوو عەبدولحەمیدی دووەم؟ جا ئەگەر لە رۆژانی پێشووی رابوردووی دووردا بزووتنەوەی کوردان لەدژی خەلافەت و سەڵتەنەت و ((تورکیای لاو)) هەبووبن، دەبێ بۆچی شتێکی سەیر و سەمەرەبێ کەوا لە چەرخی هۆشیاربوونەوەی ئاسیادا. لە سەدەی شۆڕشەکانی رزگاریخوازیی نیشتمانیدا، کوردیش لەپێناوی رزگاربوون لە چەوساندنەوەی نەتەوایەتیدا راست بێتەوە.

بەشێوەی گشتی رۆژێك لە رۆژان دەمارتوندی ئایینی لە رەوشتی کوردەکان نەبووە. گەلێك لە خێلە کوردەکان هەر بە رواڵەت باوەڕیان بە ئایینی ئیسلام هێنابوو. هەروا مەزهەبەکانی ئیسلام یەکەمجار لەناو کوردەکاندا پەرەی سەند. هەندێك لەو هۆزانەی ئیسلام نەبوون لە بزووتنەوەی راپەڕینەکاندا بەشداربوون وەك یەزیدییەکان و زازاییەکان و هی تر. ئەم ئایینانەی کە بەشێکی زۆری باوەڕی دیان و بتپەرستیان تێدایە، بەزۆری لەدژی یەکتری بوون. مێژووی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد ئەوە

دەسەڵمێنی کە کوردەکان هەمیشە خەباتیان کردووە لەدژی دەسەڵاتی سوڵتان و دەزگایەکەی، ئەو دەزگایەی کە بە درێژایی چەندان سەدە سیاسەتی چەوسانەوەی لە دژیان پەیڕەو دەکرد، هەموو ئەمانە ئەوە دەسەڵمێنن کە خەلیفە و سوڵتانەکان شتێکی وایان نەدا شایانی باس بێ.

گێڕانەوەی سوڵتانێتی ئەرستۆکراتی مانای بوژاندنەوەی دەوڵەتی نێوەندیی بیروکراتی بوو، کە مافی نەتەوەکانیتری پشت گوێ خستبوو. ئەمەش بەلای کوردەکانەوە سیاسەتی چەوسانەوە و نەبوونی مافە نەتەوەییەکان بوو.

بێگومان، لەژێر دروشمی ڕێزگرتنی ئیسلامدا. ڕابەرانی کورد هەوڵیاندا دەسەڵاتی شێخەکان بەکاربێنن. بۆ ئەوەی بیکەنە دروشمێك بۆ بیروباوەڕی نەتەوە پەروەرییان. لەبەر ئەوە توانییان پشتگیری موسڵمانەکان لە وڵاتدا بە تورکەکانیشەوە زامنبکەن. لێرەدا دەبێ ئەوەمان لەبەر چاو بێ کە لە تورکیای دواکەوتوودا، بەتایبەتی لە ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵاتدا کە جیاوازی چینایەتییان تێدا ئاشکرا نەبوو. بەتایبەتی لەناو کۆمەڵی کوردەواریدا دەکرا بزووتنەوەی نیشتمانی کورد بە پەردەیەکی ئایینی داپۆشرێت. هەموو ئەم ڕاستییانە ئەوە دەسەڵمێنن کە دروشمی ((ڕزگارکردنی ئایین)) لە کەمالییەکان، لەلایەن ڕاپەڕیوەکانەوە تەنیا وەك تاکتیك بۆ خەباتی سیاسی و نەتەوەییان بەکاردەهێندرا. هات و هاواری ڕۆژنامە ڕەسمییەکانی تورکیا دەربارەی ئەوەی ڕاپەڕینەکەی شێخ سەعید کۆنەپەرستانەیە بە گوێی کەسدا نەدەچوو بەشێکی کەم نەبێ. ئەو ڕۆژنامانە بە هەموو شێوەیەك هەوڵیان دەدا بزووتنەوەی نیشتمانی کورد



بەدناو بکەن. ئەمەش شتێکی ئاسایی بوو، چونکە کەمالییەکان مەسەلەی کوردیان بەکارهێنا و ڕاپەڕینەکەی کوردیان لەبەردەمی ڕای گشتی وڵات و دەرەوەیدا سووك دەکرد و بەزۆر ناتۆرە ناویان دەبرد وەك: دواکەوتوویی کۆنەپەرستی، دڕندەیی، تاڵان و برو، دەمارگیری ئایینی و شتی وا.

دواجار، بیروڕای سێیەم، کورتەی ئەم بیروڕایەش ئەوەبوو کە ڕاپەڕینەکە دەستکردی بێگانەیەو، بەتایبەتی دەستکردی ئینگلیزەکانە، دیارە پەسەندکردنی ئەم چەشنە لاف لێدانە گەلێك مەرجی پێدەوێ. لەم بارەیەوە وتاردانی نوێنەری حزبی پێشکەوتووی کۆماری ڕەشید پاشای نوێنەری ئەرزڕۆم بۆ ڕۆژنامەکانی تورکیا لە **٢٦**ی شوباتی ساڵی **١٩٢٥** دا سەرنج ڕادەکێشێ: ((...... دەربارەی چیرۆکی دەست تێوەردانی بێگانە، من باوەڕناکەم ڕاست بێ چونکە غینج و موش زۆر لە سنوورەوە دوورن. جا ئەگەر ڕاپەڕیوەکان پشتیان بە یارمەتی دەرەوە ببەستایە ئەوا دەبوو لەناوچەکانی نزیك سنووردا جموجۆڵیان بکردایە و لەگەڵ خێڵەکانی ئەم ناوچانەدا یەکیان بگرتایە کە دەستەڵاتی بەڕێوەبەری تورکیای تێدا نییە))[*].

بەمجۆرە دەردەکەوێ کە ڕاپەڕینەکە بە هاندانی دەرەوە بەرپا نەبوو، بەڵکو لە ئەنجامی هەندێك هۆی کاریگەر و هەمیشەیی ناوخۆدا بەرپاکرا. یەکێك لەو هۆیانە لەو بەڵگەنامانەدا دەردەکەوێت کە ناشد حەقی پەیامنێری

(*) B. Cemal, Seyh Sait Isyani. S. S. 2.

رۆژنامەی ((وقت)) لە دیاربەکر کۆی کردوونەوە. ئەوەبوو ناوبراو سەرنجی کۆبوونەوەکانی دادگای سەربەخۆیی دەدا. لە وتاری نوێنەری گشتیدا بۆ بەرگریکردن وەکو ئەو پەیامنێرە وەریگرتووە و وتراوە: ((هۆیەکان و سەرچاوەی ئەم شۆڕشەی دوایی، کە لە ویلایەتەکانی رۆژهەلاتی نیشتمانی تورکیای نەمرمان بەرپاکرا، هیچ شتێکی لەوانیتر جیاواز نییە کە لە بوسی و غیر و تفوفین لەمێژە روویانداوە. ئەو نەریت و ئامانجانەی لە شۆڕشی کوردەوە هەلّدەقولێن هەر ئەو نەریت و ئامانجانەن کە بوونە هۆی جیابوونەوەی سوریا و فەلەستین)).

هەروا سەرۆکی دادگای سەربەخۆیی لە وتاری کۆتاییدا بۆ تاوانبارانی بە لەسێدارەدان یان کاری سەختی هەمیشەیی حوکم دران گوتی:

(( هەندێکتان خراپی دام و دەزگای بەڕێوەبەری حکومەتی کردە بیانوو بۆ بەرپاکردنی راپەڕین، هەندێکیشتان بەرگرییان لە خەلافەت کرد، بەلاّم هەر هەمووتان لە یەك مەسەلەدا رێککەوتبوون: کە ئەویش کوردستانێکی سەربەخۆییە))(*).

ئا بەم شێوەیە نوێنەرانی دەزگای بەڕێوەبەریی تورك خۆیان بە هەرحالّ ناچار بوون دان بە نیوەی راستیدا بنێن سەبارەت بە هۆیە راستییەکانی بەرپابوونی راپەڕینەکەی کوردان.

---

(*) لەم کتێبە وەرگیراوە:

L. Rambout. Les Kurdes etlec, droit, Paris, 1977, P. 27.



سەرەڕای ئەمەش ئاخۆ دەتوانرێ راپەڕینەکەی شێخ سەعید بە راپەڕینێکی نەتەوەیی بەرفراوانی کورد دابنرێت؟ ئەگەر بەشێوەیەکی گشتی بڕوانینە هەموو بەشەکانی کوردستان، ئەوا وەلاّمەکە بە چەشنێکی سەلبی دەبێ، چونکە راپەڕینەکە لەلایەن رابەرانی کوردی دەرەوەی تورکیاوە، لەلایەن رابەرانی وەك ئیسماعیل ئاغای سمکۆ، شێخ مەحمودی حەفید و ئەوانیترەوە پشتگیری لێنەکرا و یارمەتی نەدرا. سەرەڕای ئەمە تەنانەت هەندێك لە خێلەکانی کوردستانی تورکیاش وەك خێلی لولان، فورمیك و کوردەکانی دەرسیم و هەندێکی تر پشتگیری راپەڕینەکەیان نەکرد. لەوەش زیاتر بەشێکیان هاوشانی کاربەدەستانی تورکیا راوەستان. ئا لێرەدا تارادەیەك جیاوازی ئایینی و مەزهەبی نێوان خێکان دەوری هەبوو، بەلاّم هۆی سەرەکی ئەوەبوو زۆریان. بۆ نموونە وەکو کوردەکانی دەرسیم باوەڕیان بە توانای سەرکەوتنی راپەڕینەکەی شێخ سەعید نەبوو، لەبەرئەوە حەزیان نەدەکرد خۆیان بخەنە مەترسی و تالووکەوە. یەکێك لە تراژیدیای بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد نەبوونی کاری هاوبەشی یەکگرتووی نێوان سەرکردەکانیەتی، کە بەدوای بەرژەوەندی خۆیاندا رۆیشتوون، واتە بزووتنەوەیەکی نیشتمانی یەکگرتوو پێکنەهاتبوو. ویڕای ئەوەش دەتوانرێ و بەلّکو پێویستە راپەڕینەکەی شێخ سەعید بە راپەڕینێکی میللی دابنرێت، چونکە زۆربەی کوردەکانی ویلایەتەکانی رۆژهەلاّت و باشووری رۆژهەلاّت و هەموو توێژە کۆمەلایەتییەکانی ناو کۆمەلّی کوردەواری بەشدارییان تێداکرد. لە جوتیارەوە تا رەوەندەکان و نوێنەرانی بورژوای

بازرگـان و شـێخەکان و ئاغاکـان و ڕۆشـنبیرانی عەسـکەری و مـەدەنی و تەنانەت حەمالەکانی ئەستەمبۆڵیش دیارە بەشداریکردنی ئەم توێژانە لـەم بزووتنەوەیەی کورددا بە تەنیا لەبەر ئامانجی نەتەوەیی نەبوو، بەڵکو هەروا ئامانجی خۆیشی تێدابوو، بەڵام ئەمە ڕێگەی لێنەگرتن کە ریزەکانی خۆیان یەکخەن تا پاڵەوانانە لە پێناوی سەربەخۆیی کوردستاندا بمرن. لەبەر ئەمـە بێ گوێدانە ئامـانجی چـینایەتی تەنگەبـەری دەرەبەگـە گـەورە کوردەکـان ڕاپەڕینەکەی شێخ سەعید وەکو ڕاپەڕینەکانی پێشووتری کوردان و ئەوانی دواییشی خاسیەت و سروشتێکی ڕزگاریخوازانەی هەبوو.



## سەرنجێکی پێویست لە وەرگێڕی کوردییەوە

ئیحسان نوری پاشا لە یادداشتەکانی خۆیدا نووسیویەتی دەڵێ: ئەم زاتانەی خوارەوە لە ٧ی نیسانی ١٩٢٥ دا لەگەڵ شێخ سەعید لە شـاری دیاربـەکر لەسێدارە دران:

١- د. فوئاد    ٢- بالولی عالی ڕەزا    ٣- شێخ شەریف

٤- شێخ عەبدوڵلا    ٥- سرمانلی حسێن    ٦- تبجیکلی حسێن

٧- باڵازادە بەهائەدین    ٨- شێخ ئیبراهیم

٩- چاباقچورلی تەیب    ١٠-جورملی حاجی حسێن

١١- شەریف عەبدولرەحیم    ١٢- توفیق ئاغا

١٣- کەمال فەیزی بەدلیسی    ١٤- شێخ عەبدولقادر نەهری.

**خوێنەری خۆشەویست!**

ئەم لیستەیەی یادداشتەکەی ژەنەڕاڵ ئیحسان نوری پاشا کە هەندێك جیاوازە لەگەڵ ئەوەی لە کتێبەکەی د. حەسرەتیاندا هاتووە، بە مەبەستی سەرنجدان و لێکۆڵینەوە نووسیمان و هیوادارین لە دوارۆژا لەم رووەوە هەندێ زانیاری راست و رەوان بلاوبکەینەوە....لەگەڵ سوپاس.



## لیستی تەواوی ناوەکان

ئیسماعیل ئاغا سمکۆ.

شێخ ئیسماعیل (برای شێخ سەعید).

ئەنیس بەگ.

ئیسماعیل حەقی.

ئیسماعیل (رائیدی تەقاویتکراو).

شێخ ئیسماعیل (جزیری).

ئەحمەدی عەلی حاجی سەبری.

شێخ ئەیوب.

ئارمسترۆنگ.

باقی نازێ.

باقی شیرین.

بەیتار نوری (دێرسیمی).

بەحری.

بوزان ئاغا.

بابۆ.

بەحری ئەمین (رائیدی تەقاویتکراو).

بوغوس (ئاسنگەر).

پیرەمێرد (حاجی تۆفیق).

تەیمور ئاغا.

جەمیل بەگ (وەزیری ناوخۆ).

جەمال (مەلا - مامۆستای سەرەتایی).

جەلال دەباغ.

حەسرەتیان. م. دکتۆر.

حوسەین بارزانی.

حەسەن خەیری.

حوسنی ئەفەندی (ملازمی یەکەم).

حەسان (فەقێ).

حەسەن (حاجی).



حەتۆ.

حاجی ئاختی (پارێزەر).

حەمید.

حوسێن.

خالد جبری بەگ (عەقید). خالد جبران بەگ.

خالد حوسنی بەگ (خالد حەسەنان بەگ).

خۆجە عەسکەری.

خالد عەبدولحەمید (حاجی).

دیو ئۆغلۆ حسێن.

رەئووف بەگ.

رەجەب بەگ (بەکر)- وەزیری بەرگری.

رەشید ئاغا.

رەشید (چەرکەسی).

شێخ سەعیدی شێخ مەحموودی شێخ عەلی (نەقشبەندی).

سەعید رەزا.

شێخ سەراج.

سلێمان.

شێخ شیڤێ.

شمسەددین خالد حەسەنان بەگ.

شەوکەت.

سری بەگ.

سالح بەگ.

حاجی صادق.

شێخ تاهیر (برای شێخ سەعید).

شێخ عەلی سەبتی.

عەلی رەزا (عالی رەزا).

سەید عەبدولقادر نەهری.

شێخ عەبدولرەحیم.

عومەر فارو.

عیسمەت پاشا.

عەلی جەمال (میراداجی) پارێزەر.

شێخ عەبدولرەحمان.



شێخ عەبدوڵلا.

عەلی کەمالی برای گوجوك محەمەد ئەفەندی.

عوسمان نوری.

عەباسی کوڕی شێخ سەعید.

عیسمەت ئینۆنۆ.

عەلی فوئاد پاشا.

شێخ عەبدوڵلا (میلیکانی).

مەلا عەلی ئیمام.

شێخ عەبدوللەتیف (جەزیری).

عەبدولمەجید (داواکاری گشتی لە مەلازگرد).

عەلی سائیب. عەبدولحەمیدی دووەم (سولتان).

شێخ غالب.

فەرید پاشا (وەزیری پێشووی جەنگ).

فەوزی پاشا (چەقماق) سەرۆکی ئەرکان.

فەتحی بەگ (سەرۆکی حکومەت).

فەرەیدون فیکری بەگ (نوێنەری دەرسیم).

دکتۆر فوئاد بەگ.

قاسم جبران.

قاسم (رائیدی تەقاویتکراو) (فارتو).

کازم قەرەبەکر پاشا.

کازم پاشا (ئوربای).

کوسیل پاشا (سەرۆکی کەنیسە).

کیلیچ عەلی.

کەمالەدین سامی پاشا (ژەنەڕاڵ).

کورعەبدوڵڵا سعادی.

کەمال فەوزی.

کامل.

دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد.

گوچەك محەمەد خولیۆس ئەفەندی.

شێخ مەحموودی حەفید.

حاجی موسا.

شێخ مەحموود شێخ عەلی.



شێخ مەحموود.

مستەفا کەمال (ئەتاتورك).

مستەفا عاسم (ملازم).

شێخ محەمەد رەشید.

محەمەد سەعید نەقشبەندی (شێخ سەعید).

محموود عیزەت بەگ - وەزیری دادپەروەری.

محەمەد ئاغا.

سەید محەمەد نەهری.

محەمەد.

محەمەد موکری (ملازم).

موفتی بەگ (سەرۆکی دادگا).

مەقسوود.

نایف.

نیازی (فەرمانبەری تەندروستی).

ناشد حەقی.

نیعمەت.

